بەشێک لە پەیامەکانی نوور

# چەپکێک پەروەردەی ئیمانی



بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی
دایناوە

فاروق ڕەسووڵ یەحیا
کردوویە بە کوردی



**ئەم پەیامە:**

* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.

* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.

* (**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.

* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.

* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز.

* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.



* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٧٠)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەکانی نوور

# چەپکێک
# پەروەردەی ئیمانی

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

## بریسکەی بیست و هەشتەم

(ئەم بریسکەیە لە چەند پوختە بڕگەیەك پێكهاتووە كە بۆ دڵدانەوەی برایانی هاوڕێم لە "بەندیخانەی ئەسكی شـەهر"دا نووسران، لەو كاتەی كە قسە و تێكەڵیم لەگەڵ خەڵكیدا لـێ قەدەغە كرابوو)

(دانەر)

# گفتوگۆیەکی نیان

## لەگەڵ "سلێمان ڕوشدی"دا[1] کە ڕەمزی وەفا و ئیخلاسە و، خاوەنی دڵ و دەروونێکی خاوێنە

هەرکە لە وەرزی پایزدا کاتی دەربازکردنی "مێش" لە ئەرکی سەرشانی ژیانی نزیك دەبێتەوە، هەندێ لەو کەسانەی کە تەنها سوود و بەرژەوەندیی خۆیانیان مەبەستە، بۆ ئەوەی مێش بێزاریان نەکات، دەچن دەرمانی قەڵاچۆکردنیان بۆ بەکاردەهێنن! منیش کە ئەم ڕەفتارەم دی، هەستی ناسکیی دڵم بەرامبەر بەو مێشانە جووڵا و، دوژمنایەتیکردن و قەڵاچۆکردنیان کارێکی گەلێ بەتینی تێکردم. هەرچەند ئەمجارە - وێڕای بەکارهێنانی دەرمان - پتر لە جاران ژمارەیان زیادی کرد!

ژوورەکەی ناو بەندیخانەم تەنافێکی جلهەڵخستنی تێدا بوو، ئەو وردیلە باڵندانەش بەوپەڕی ڕێکوپێکی و جوانی لەسەر ئەو تەنافە ڕیزیان دەبەست.

لەبەر ئەوە، بە "ڕوشدی"م وت:

واز لەو باڵندانە بهێنە و بەرگ و پۆشاکەکان لە جێیەکی تردا هەڵبخە.

وتی: ئێمە ئەم تەنافەمان پێویستە.. با مێشەکان بڕۆن جێیەکی تر بۆ خۆیان بدۆزنەوە!

---

(١) سلێمان ڕوشدی لە قوتابییانی پێشینی مامۆستا نوورسییە لە شاری ئیسپارتە. (وەرگێڕ)

بە هەر حاڵ.. بە بۆنەی ئەم گفتوگۆ نیانەی نێوانمان، دەرگای باس لەسەر مێش و هەنگ و مێرووە زۆر و زەبەندەکانی تری هاوچەشنیان کرایەوە و، پێیم وت:

ئەم جۆرە زیندەوەرانەی کە هەمیشە بە زۆری زیاد دەکەن و نوسخەی زۆریان لەبەر دەگیرێتەوە، گەلێ ئەرکی گرنگیان لە ئەستۆدایە. ئەوەتا "کتێب" هەتا بەنرخ بێت چاپی زیاتری لێ دەردەچێت. واتە ڕەگەزی مێش(الذباب)[1] دارای ئەرکی گرنگ و خاوەنی نرخ و بەهای یەکجار بەرزن، چونکە بەدیهێنەری دانا نوسخەی گەلێ زۆر لەو نامیلکە قەدەری و وشە قودرەتییانەی خواوەند دەگرێتەوە.

بەڵێ، ئەم جۆرە مێشەی کە هەمیشە دەڵێی دەستنوێژ دەگرێت و خەریکی پاکژکردنی دەموچاوەکانی و خاوێنکردنەوەی باڵەکانیەتی، بابەتێکی گرنگی ئەم ئایەتە پیرۆزە پێکدەهێنێت کە دەفەرموێ:

**﴿يا أَيُّهَا النَاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوْ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئاً لايَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ﴾** (الحج:٧٣).

واتە: ئەگەر سەرجەمی هۆکارەکان و گشت ئەو شتانەش کە گومڕایان، جگە لە خوا، سیفەتی خوایەتییان بۆ دادەنێن، هەر هەموویان بۆ مەبەستی بەدیهێنانی مێشێك کۆببنەوە، ئەوا تێکڕا دەستەوسانی و کۆڵەواریی خۆیان دەردەبڕن. واتە بەدیهێنانی مێش موعجیزەیەکی پەروەردگاری و ئایەتێکی تەکوینیی هێندە مەزنە کە ئەگەر سەرجەمی هۆکارەکان کۆببنەوە و پشتی یەکتری بگرن، هێشتا ناتوانن شتێکی هاووێنەی ئەو ئایەتە پەروەردگارییە بەدی بهێنن و لاسایی بکەنەوە!

---

(١) وشەی: "ذُباب" هەموو مێروویەکی باڵدار دەگرێتەوە. (وەرگێڕ)

جا ئەم موعجیزەیە، توانیی بەسەر "نەمروود"دا زاڵ بێت و، بەرگرییەکی هێندە بەهێزیش لە حیکمەتی بەدیهێنانی خۆی بکات کە هەموو پەڵپ و رەخنە و بەهانەیەك - هەرچەندەش زۆر بن - بێدەنگ بکات. ئەوەبوو لەو کاتەدا کە حەزرەتی مووسا - دروودی خوای لەسەر بێت - سکاڵای بێزاربوونی لە دەست مێش لای خوای گەورە دەربڕی و، فەرمووی:

"ئەی پەروەردگار! بۆچی هێندە وەچەی زۆرت لەم بەدیهاتووە بێزارکەرانە خستووەتەوە"؟

بە ئیلهام وەڵامی درایەوە کە: تۆ یەك جار رەخنەت لە مێش گرت، کەچی ئەو زۆر جار سکاڵا لە دەست مرۆڤ دەکات و، دەڵێت:

"ئەی پەروەردگار! ئەم مرۆڤە مەزنە سەرزلە تەنها بە یەك زمان ناوت دەبات و یادت دەکات، تەنانەت هەندێ جاریش لە یادی تۆ بێئاگا دەبێت. بەڵام ئەگەر لە بریی سەری ئەو، بەدیهێنراوی وەك ئێمەت دروست بکردایە ئەوا هەزاران بەدیهاتوو دروست دەبوون کە هەر هەموویان زیکر و یادی تۆیان دەکرد"!

ئنجا سەرەڕای ئەمە، ئەوپەڕی گرنگی و بایەخ بە پاکوخاوێنی دەدات و، بە چەشنی یەکێك کە دەستنوێژ بگرێت، هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی دەموچاوی و سڕینی باڵەکانیەتی!

کەواتە، بێ هیچ گومانێك، ئەم چەشنە زیندەوەرانە کارمەندی وئەرکی گرنگ و مەزنیان لە ئەستۆدایە، بەڵام لەبەر ئەوەی مەودای ڕوانینی دانست و زانستی مرۆڤ بەرتەسك و سنووردارە، ئەوا هێشتا پەیی بەو کار و ئەرکانە نەبردووە!

بەڵێ، خوای گەورە هەندێ دڕندە ئاژەڵی گۆشتخۆری (لە دەریاکاندا) بەدی هێناوە، وەك بڵێی کارمەندی پاکژکردنەوەی ژینگەی ناو دەریاکان بن. ئەوەتا بەوپەڕی وردی و لێزانی کارەکانیان جێبەجێ دەکەن و ئەرکی سەرشانیان ڕادەپەڕێنن و، ڕۆژانە لاشەی ملیۆنەها مردارەوەبووی ناو دەریاکان

دەقــۆزنەوە و، خـــاوێنیی ڕووی دەریـــا ڕادەگـــرن و لەو دیـــمەنە چەپەڵ و بێزلێکراوانە ڕزگاری دەکەن[١]..

خۆ ئەگەر ئەم دڕندە ئاژەڵانە بە تەواوەتی ئەرکی تەندروستی و پـاکژکردنی سەرشانیان جێبەجێ نەکردایە، هەرگیز ڕووی دەریـا ئـاوا بە چەشـنی ئـاوێنەی درەخشان نەدەبریسکایەوە، بەڵکو دیمەنی دەریا هێندە چەپەڵ و بێـزراو دەبـوو کە مرۆڤی گرفتاری بێزاری و خەم و دڵتەنگی دەکرد.

هەروەهـا خـوای گەورە گەلـێ ئـاژەڵی دڕنـدە و باڵنـدەی گۆشـتخۆری بە وێنەی کارمەندی پاکژی و فەرمـانبەری تەندروسـتی بەدی هێنـاوە، کە هەمـوو ڕۆژێـك ڕووی زەوی لە لاشـەی ملیارەهـا زینـدەوەر و باڵنـدەی مردارەوەبـوو خاوێن دەکەنەوە و، لە چەپەڵی دەپارێزن و زیندەوەرانیش لەو دیـمەنە بێـزراوە دڵتەنگـی بەخشـە ڕزگـار دەکەن. چـونکە ئەو زینـدەوەر و باڵنـدە کارمەنـدانە دەتوانن لە دووریی پێنج شەش سەعات ڕێگاوە پەی بە جێی کەلاك و لاشـەی مردارەوەبووان ببەن و، بە هاندان و ڕێ پیشاندانی ئیلهامێکی خوایی هەسـتیان پـــێ بـــکەن و بیانـــدۆزنەوە. ئیـــتر بەرەو ئەو جێگایـــانە دەڕۆن و کەلاکی مردارەوەبووانی تێدا لادەبەن!

---

(١) بەڵـێ، تەنهـا یەك مـاسی هەزاران گەرا دادەنێـت، کە ئەمـانەش وردیـلە ماسـیان لـێ دەردەچێت. هەندێ جاری واش هەیە ملیۆنێك گەرا دادەنێت!

بەمەش دەردەکەوێت کە ژمـارەی لەدایکبـوان و ئەنـدازەی مـردووانی مـاسی ڕێـکی یەکـتر دەوەستنەوە، تاکو هاوسەنگیی دەریاکان بپارێزن.

ئنجا یەکێـك لە لایەنە ناسـك و نیانەکـانی درەوشـانەوەی میهرەبـانی خواوەنـد لە جیـاوازیی یەکجار گەورەی نێوان جەستەی دایکان و بێچووە بچووکەکانیاندا دەردەکەوێت، ئەوەتا دایك ناتوانێـت بـۆ هەرلایەك بـڕوات کە بێچووەکـانی بـۆی دەڕۆن، چـونکە هەنـدێ جێگـا هەن بێچووەکانی پێدا دەچـن، بەڵام گەورەکـانی پێـدا تێـپەڕ نـابن! بـۆیە خـوای گەورەی دانـا و میهرەبان لە نێوان بێچووە وردیلەکاندا پێشەوایەکی بچـووك دەکـات بە سـەرکردەیان و ئەرکی دایکایەتی بەو دەسپێرێت و لەو کارمەندییەدا دەیخاتە کار! (دانەر)

جا ئەگەر ئەم کارمەند و فەرمانبەرانەی پاکژی و تەندروستیی سەر وشکایی ڕووی زەوی نەبوونـایە و، بەم چەشـنە ئەرکی سەرشـانیان بە ڕێـکی و تەواوی ئەنجام نەدایە، ئەوا ڕووی زەوی گرفتاری بارودۆخێکی هێندە پەرێشـان دەبـوو کە مایەی بەزەیی بوایە.

بەڵێ، ڕۆزیـی حەڵاڵـی ئـاژەڵە درنـدەکان تەنهـا لاکی مردارەوەبووەکـانە و خواردنی گۆشتی حەیوانی زیندوویان لێ حەرامە، تەنانەت تووشی سـزا دەبـن گەر هی زیندوو بخۆن، چونکە فەرموودەی پیرۆزی: "حتَّى يقتَصَّ الجَمّاءُ مِـنَ القَرْناءِ"[1] بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە ئەو ئـاژەڵانەی پـاش نەمـانی جەسـتەیان ڕۆحیان دەمێنێتەوە، لە خانەی مانەوەی ئەودنیادا سزا و پاداشتی گونجاویان بۆ دانراوە..

جا لە سەر ئەم بناغەیە دەتوانرێت بوترێت کە:

"مێروولەکان"یش کارمەنـدێکن ئەرکی کـۆکردنەوەی وردیـلە نیعمەتەکـانی خـوای گەورە و پاراسـتنیان لە سـووکایەتی پێکـردن و لەنـاوچوون، خـراوەتە ئەستۆ، تـاکو ئەو وردیـلە نیعمەتـانە ڕێـزی شـایانیان لـێ بگیرێـت و ژێـر پـێ نەکەون. جـگە لەمەش ئەو مێـروولانە، بە چەشـنی کارمەنـدی تەندروسـتی، لاشەی مردارەوەبووی زیندەوەرە بچووکەکانیش کۆ دەکەنەوە.

پاشان جگە لەو ئەرکانەی کە باس کران، گەلێ فەرمـانبەری و ئەرکی تـر لە ئەستۆی مـێش نـراوە. چـونکە "مـێش" میکرۆبەکـانی نەخـۆشی و ئەو مـاددە ژەهراوییانەش مرۆڤ نایانبینێت، پاکژ و پاڵفتە دەکەن و، دەیچەسپێنن کە مـێش

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسولَ اللـه ﷺ قـال: "لتـؤدُّنَّ الحقـوقُ إلى أهلهـا يـومَ القيامة، حتَّى يُقادَ للشاة الجلحـاءِ مِـن الشـاةِ القَرنـاءِ". رواه مسـلم بـرقم ٢٥٨٢ والترمـذي ٢٥٣٥ (تحفة الأحوذي) وقال: في الباب عنَ أبي ذر وعبدالله بن أنيس. حـديث أبي هريـرة حديث حسن صحيح (ومعنى الجلحاء: أي التي لا قرن لها). (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە)

گوێزەرەوەی میكرۆب نییە، بەڵكو بە پێچەوانەوە لە ڕێـی مـژین و خـواردنەوە، میكرۆبە زیانبەخشەكان لەناودەبەن و مادە ژەهراوییەكـانیش دەگـۆڕن بە چەنـد ماددەیەكی تر. بەم چەشنە ڕێ لە بڵاوبوونەوەی گەلـێ نەخـۆشی دەگـرن و لە سنووریكدا ڕایاندەوەستێنن. زۆریی لەڕادەبەدەری ژمارەی مێشـەكان، بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی كە ئەوان كارمەنـدی تەندروسـتی و فەرمـانبەری پـاكژی و كیمیاگەری كارامە و لێـزانن. هەروەهـا دەریـدەخەن كە حیكمەتـێكی فـراوانی خوای گەورە لە بەدیهێنانی مێشدا هەیە. چونكە ماددەی سوودبەخش و بەنـرخ بە ژمارەیەكی زۆر دروست دەكرێن و وەچەیان لێ دەخرێتەوە[1].

ئەی ئەو مـرۆڤەی كە هەمـوو ئامـانجێكی تەنهـا سـوود و بەرژەوەنـدیی خۆیەتی:

جـگە لە سـوودە زۆرەكـانی مـێش بـۆ ژیـان، تەنهـا سـەیری یەك دانە لەو سوودانە بكە كە بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، تاكو واز لە دوژمنایەتیی مێش بهێنیت:

مێش، هەروەك لە دەمی تەنیـایی و نامۆییتـدا، هـاودەمی و دڵنەوایـیت بـۆ دەستەبەر دەكات، بە هەمان جۆر لە خەوی بێئاگـاییش بەخەبەرت دەهێنێـت و لە كاتەكـانی پەرتەوازەیـی بیـر و ئەندێشـەدا بێـدارت دەكـاتەوە. ئەوەتـا وەك لەبەرچـاودایە، بە دەسـتنوێژ و نـوێژ و پـاككردنەوەی دەموچـاوی، چەنـدەها فەرمانبەری و ئەركی بەرزی مرۆڤانەت یاد دەخاتەوە، چەشـنی: جموجـووڵ و چوستوچالاكی و پاك و خاوێنیی بەردەوام!

---

(١) ئەم برگەیەی خوارەوەی "یوونس ئەمرە"ی بەناوبانگ، زۆر بە جوانی ئاماژەی بۆ مەودای ئەو لایەنە دەراسا و ناوازانە كردووە كە لە باڵی مێشدا هەن، هەروەهـا بـۆ ئەوەش كە "مـێش" سنعەتێكی مەزنی پەروەردگارە:

(باڵی مێشێكم لە چل باردا هەڵگرت، كەچی بە هەر هەموویان بۆیان هەڵنەگیـرا و، هەروا بە نووسراوی مایەوە). (دانەر)

هەروەها مێرووی "هەنگ"یش، کە جۆرێکن لە جۆرەکانی مێش، باشترین و خۆشترین خۆراکی وەك هەنگوینت دەرخوارد دەدەن و، وەك لە دەقی قورئـانی پیرۆزدا هاتووە: سرووشی خوای گەورەیان ئیلهام کراوە. کەواتە دەبێ خۆشـت بوێن!

دوژمنایەتیکردنی مێش کارێکی ستەم و نـاڕەوایە و، پێشـێلکردنی مـافی ئەو زینـدەوەرانەیە کە یـارمەتیی مـرۆڤ دەدەن و، بـۆ هـاوڕێیەتیی تێدەکۆشـن و، ئازارەکانیشی هەڵدەگرن..

تەنها بوار بە قەڵاچۆکردنی زیانبەخشەکانیان دراوە، تاکو بە وێنەی پاراستنی مەڕ لە گورگ، مرۆڤیش خۆی لە زیانبەخشەکانیان بپارێزێت.

ئایا ناگونجێ مێشوولە و کـێچ - کە بەسـەرماندا زاڵ کـراون - هەریەکەیـان کەڵەشاخگرێکی سروشتی بن؟ واتە کارمەند و فەرمانبەری هەڵمژینـی خـوێنی پیسی ناو خوێنبەرەکانمان بن لە دەمی پەرەسەندنی گەرما و زیـادبوونی پـتر لە پێویستی خوێن لە لەشی مرۆڤدا؟

سُبْحَانَ مَنْ تَحَيَّرَ فِي صُنْعِهِ العُقُولُ!

ڕۆژێکیان لەگەڵ نەفســی خۆمـدا لەســەر نیعمەتەکـانی خـوای گەورە لە مشتومڕدا بووم؛ چـونکە نەفسـم ئەو نیعمەتـانەی بە هـی خـۆی دەزانی و، لەم ڕێیەوە لە خۆی بایی بوو و دەستی دابووە شانازی و مەدح و بەخۆوە نازین..

پێم وت:

تۆخاوەنی هیچ شتێك نییت، هەموو ئەو نیعمەتانە سپاردەن لات دانراون.

بەم قسەیەم وازی لە شانازیکردن و بەخۆنازین هێنا. بەڵام تەمبەڵی گرتی و، وتی:

کەواتە بۆچی چاودێریی شتێك بکەم کە هی خۆم نەبێت؟ ئەگەر تیابچێت و نەمێنێت من چ زیانێك دەکەم؟!

هەر کە نەفسم وای وت، یەکسەر مێشێکم دی بەسەر دەستمەوە نیشتەوە و، بە ڕێکوپێکی و جوانی دەستی کرد بە خاوێنکردنەوەی دەموچاوی و باڵەکانی، هەرچەندەش ئەمانەت و سپاردەن لای، کتومت بە وێنەی سەرباز کە چەك و پۆشاکێك پاك دەکاتەوە هی خۆی نین و ئەمانەتی دەوڵەتن لای دانراون!

که ئەم دیمەنەم دی، بە نەفسی خۆمم وت:

"تەماشای ئەم مێشە بکە"!

ئەویش سەیری کرد و، پەند و دەرسی گرنگی لێ وەرگرت.

بەم جۆرە، "مێش" بوو بە مامۆستایەك بۆ نەفسی تەمبەڵم!

* * *

پاشەڕۆی مێش، لە ڕوانگەی پزیشکییەوە، هیچ زیانێکی نییە. بەڵکو هەندێ جار دەبێت بە خۆراکێکی شیرین وخواردەمەنی (بۆ چەند مێروویەکی تر). چونکە هەرگیز لە حیکمەتی خوای گەورە بە دوور نازانرێت، تەنانەت هەر خواستی ئەو حیکمەتەیە کە مێشەکان بکات بە مەکینەیەکی پاڵاوتن و ئامێری گۆڕینی ماددە زیانبەخشەکان بە ماددەی سوودبەخش. چونکە مێشەکان هەزاران ماددەی جۆراوجۆر دەخۆن، لەوانەی کە مایەی پەیدابوونی میکرۆب و ژەهرەکانن.

بەڵێ، جگە لە "هەنگ" هەندێ جۆری تری مێش هەن کە ماددە گەنیوەکان دەخۆن[1] و لە بریی پاشەڕۆ، بە وێنەی بارینی گەزۆ بەسەر گەڵاکاندا، چەندین

(١) لەکۆتایی وەرزی بەهار و لەسەر لقی درەختی چواله و قەیسیدا، جۆرە مێشێکی ورد لە شێوەی بارستاییەکی ڕەشدا بەدی دەهێنرێن و دەلکێن بە لقی درەختەکەوە لە بریی پاشەڕۆ چەند دڵۆپێك شیلەی چەشنی هەنگوین دەردەدەن، ئیتر جۆرەکانی تری مێشیان لێ کۆدەبێتەوە و ئەوشیلەیە دەمژن. جۆرێکی تری مێش لە پیتاندنی هەندێ گوڵ و درەختی

ماددەی شیرین دەردەدەن و، دەیچەسپێنن کە ئەو مێشانە کارگەی گۆڕینی ماددە زیانبەخشەکانن بۆ ماددە و کەرەسەی سوودبەخش.

* * *

بەم جۆرە، بە ئاشکرا و لە بەرچاودا مەودای مەزنیی نەتەوەی بچووکی مێش و، ڕادەی گرنگی و کارمەندی و ئەرکی سەرشانیان دەردەکەوێت.

وەك بڵێی نەتەوەی مێش بە زمانی حاڵ پێمان دەڵێن:

(بۆ بچووکیی جەستە و قەبارەمانِ مەڕوانن، بەڵکو سەیری مەزنیی فەرمانبەری و ئەرکی ئەستۆمان بکەن و، بڵێن: سُبْحَانَ اللّٰه!)

* * *

---

بەرداری وەك هەنجیردا دەخرێنەکار. جۆرێکی تری مێش "گوڵەستێرە"یە، کە لە شەودا دەدرەوشێتەوە و، بەدیهاتوویەکی هێندە سەیرە کە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت و، داخوازی بیرکردنەوە و تێڕامانە. هەروەك هەندێکی تریان وەك زێڕ دەبریسکێنەوە.

دەبێ مێشوولە و زەردەواڵەش لە یاد نەکەین، ئەوانەی کە وەك سەرباز پڕچەك کراون و ڕمیان دراوەتێ. جا ئەگەر جڵەوی ئەم مێشانە بە دەستی بەدیهێنەری میهرەبانەوە نەبێت و، لە خۆڕا هێرش و پەلامار بۆسەر زیندەوەران و گرۆی مرۆڤ ببەن، ئەوا هەروەك نەمرووديان کوشت، ڕەگەزی مرۆڤیشیان لە ڕووی زەویدا بنەبڕ دەکرد و، واتای ئاماژەیی ئەم ئایەتە پیرۆزەشیان بە کردار تەفسیر دەکرد، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئاً لا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ﴾.

لەبەر ئەوە، ڕەگەزی مێش، کە سەد ڕەگەز و جۆری جیاجیان و خاوەنی ئەو تایبەتکارییە ناوبراوانەن، دارای گرنگییەکی ئەوتۆن کە پلە و پایەی ئەوەی پێ ڕەوا بینیون ببن بە کەرەسەی باس و لێدوانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ﴾. (دانەر)

# پیتەکانی قورئان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (يس:٨٢)

لە ئاماژەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێت کە:

"بەدیهێنان" بە "فەرمان"(ئەمر) ئەنجام دەدرێت و، گەنجینەکانی توانستی خواوەندیش لە نێوان "کاف" و "نون"دان.

ئەم نهێنییە وردەش گەلێ ڕووی زۆری هەیە و هەندێکیشیان لە پەیامەکاندا باس کراون. بەڵام ئێستا هەوڵ دەدەین بە نموونەیەکی ماددی و هەست پێکراو لەم نهێنییە تێبگەین، تاکو ئەو فەرموودە پیرۆزانەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕوانینی ئەم سەردەمە ماددییەوە نزیك بخەینەوە کە لە بارەی تایبەتکاری و کاریگەرییە ماددییەکانی پیتەکانی قورئانەوە هاتوون. بە تایبەت پیتە لێکپچڕاوەکانی سەرەتای سوورەتەکان. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

بەدیهێنەری شکۆمەندی خاوەن عەرشی مەزن، چوار عەرشی ئیلاهیی هەیە کە تەوەرەن بۆکارسازی و ڕاپەڕاندنی کاروباری بوونەوەرانی ئەم گۆی زەوییەی کە وەك مەڵبەندێکی مەعنەویی جیهان و بە وێنەی دڵ و قیبلەی بوونەوەران وایە:

یەکێکیان: عەرشی پاراستن و ژیانە. کە بریتییە لە: "گڵ"(خاك) کە شوێنی تیادەرکەوتنی ناوی جوانی "الحفیظ و المُحیی"یە.

دووهەمیان: عەرشی فەزڵ و میهرەبانییە. کە توخمی "ئاو"ە.

سێهەمیان: عەرشی زانست و دانستە. کە توخمی "ڕووناکی"یە.

چوارەمیان: عەرشی ئەمر و ئیرادەیە. کە توخمی "هەوا"یە.

ئـێمە بە چـاوی خۆمـان دەبینـین کە ئەو کانزایـانەی تەوەرەی چەنـدین پێویسـتیی بێسـنووری زینـدەوەران و مـرۆڤ و چەنـدەها ڕووەکی جیاجیـا و جۆراوجۆریشـن، هەموویـان لە "گـڵ"ێکی سـاکارەوە پەیـدا دەبـن. هەروەك دەبینین کە چەندین موعجیزەی بێسنووری سنعەتی خواوەنـد لەنـاو زینـدەوەرە جیاجیاکاندا لە "ئاو"ەوە سەر هەڵدەدەن، بە تایبەت لە "مەنی"ی زیندەوەران کە شلەمەنییەکی وەکو ئاو وایە. واتە ئەو هەموو دانە دانە و جۆرە زۆر و زەبەنـدە و جیاجیایـانە لە تـوخمێکی سـادە و بە ڕێکـوپێکییەکی تەواوەتی پەیـدا دەبـن و، لەسەر لاپەڕەیەکی سادە و ساکار و لە شێوەی چەند نەخشونیگارێکی نـاوازەی بێسنووردا دەنووسرێن. کە ئەمەش دەبێت بە ڕێـنما و بەڵـگە لەسـەر ئەوەی کە "ڕووناکی" و "هەوا"ش وەك ئەم دوو عەرشـە وان و، جێـی دەرکەوتنـی چەنـد موعجیزاتێکی سـەرسـووڕهێنی قەڵەمی زانسـتی وێنەکێشـی ئەزەلی و زانـا و شـکۆمەندن و، لاپەڕەی تێـدانووسـینی ئەمـر و ئیـرادەی ئەون، بە وێـنەی دوو عەرشی پێشوو، هەرچەندەش سادە و ساکارن.

ئێستا واز لە توخمی "ڕووناکی" دەهێنین و، بە بـۆنەی ئەم مەسـەلەیەمانەوە هەوڵ دەدەین پەردە لە ڕووی ئەو لایەنە سەرسـووڕهێنەر و نامۆیـانەی ئەمـر و ئیـرادە لابـدەین کە لە تـوخمی "هەوا"دا هەن، کە ئەویـش سـەبارەت بە گـۆی زەوی عەرشی "ئەمر و ئیرادە" دەنوێنێت. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئێمە هەروەك لە ڕێی "هەوا"وە پیـت و وشـەکان لە دەممانـدا دەڕوێنـین و، یەکسەر ئەو پیت و وشانە گوڵ دەگرن و بەر دەبەخشن. واتە تەنها یەك وشـە لە یەك کاتدا کە دەڵێـی "کـات" لە گۆڕێـدا نییە، دەبێـت بە دەنـکە دانەوێـڵە و لە هەوای دەرەوەشدا گوڵ دەگرێت و دەبێت بە بەرێك لە هەوا کە چەندین دانەی گەورە و بچووك لە خودی ئەو وشەیە لەخۆ دەگرێت..

بە هەمـان جـۆر، سـەیری تـوخمی "هەوا"ش دەکەیـن دەبینـین بە تەواوی گوێڕایەڵ و ملکەچ و فەرمانبەرداری فەرمانی "کُنْ فیَکُون"ە. تەنـانەت دەڵێـت هەمـوو یەکێـك لە گەردیلەکـانی ئەو "هەوا"یە سـەربازێکی هەمیشـە ئامـادە و ملکەچـی فەرمـانە لەنـاو سـوپایەکی ڕێکوپێکـدا و، بە چەشـنێ گـوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری دەردەخات بـۆ ئەو ویسـتەی کە لە فەرمـانی "کُـن"دایە دەڵێـت "کات" هەر لە گۆڕێدا نییە!

ئەمەش لە دوورترین گەردیلە و نزیکترینیاندا یەکسانە.. بۆ نموونە:

ئەو "وتار"ەی کە مرۆڤ لە ئێستگاوە پەخشی دەکات، هەر لە هەمان کاتـدا لە هەموو جێیەکی زەوی بە ڕادەیەك کە دەڵێی "کـات" لە کـایەدا نیـیە، لە ڕێـی ڕادیۆکـــانەوە دەبیســـترێن! کە ئەمەش ڕادەی گـــوێڕایەڵیی یەك بە یەکی گەردیلەکانی "هەوا" بۆ درەوشانەوەی فەرمانی " کُنْ فیَکُون" دەردەخات.

هەروەك ئەم وتارە لە هەوادا وایە، ئەو پیتـانەش بە هەمـان جـۆرن کە لەنـاو هەوادا ناجێگیرن. چونکە دەگونجێ بە چۆنێتیە خاوێنەکـانی خۆیـان و بەپێـی ئەم نهێنیی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریە ببن بە چەنـد مەزهەرێـك بـۆ چەنـدین کـاریگەریی دەرەکی و تایبەتکـاریی مـاددی. ئیـتر لەم ڕێـیەوە تایبەتکـارییەکی ئەوتۆیان تێدا دەبینرێت کە وەك ئەوە وابێت شتانی "مەعنەوی" بکەن بە "ماددی " و شتانی "غەیبی"ش بگۆڕن بە شتی "بینراو".

جا چەندەها نیشـانەی بێسـنووری تـری وەك ئەم نیشـانەیە هەیە، کە تێکـڕا بۆمان دەردەخەن "پیتەکان" کە چەند بوونەوەرێکی ناو "هەوا"ن، بە تایبەت پیـتە پیرۆزەکان و حەرفەکانی قورئان، بە تایبەتیش پیتەکـانی پەرلە(شـفرة)ی خـوایی کە پیتە لێکپچڕاوەکانی سەرەتای سوورەتەکانن، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و پێزانینی تەواوەتی و هەســت و شــعووری کامــڵ و بــێ پێــویســتبوونیش بە کــات، فەرمانەکان دەبیستن و جێبەجێیان دەکەن.

بێگومـــان ئه‌مه‌ش وا له مـــرۆڤ ده‌كـــات كه ئه‌و تایبه‌تكـــارییه مـــاددی و ده‌راسایانه بســه‌لمێنێت كه له ڕووی قودسـییه‌ته‌وه سـه‌باره‌ت به‌و پیتـانه‌ی نـاو گه‌ردیله‌كانی هه‌وا ڕیوایه‌ت كراون، ئه‌و گه‌ردیلانه‌ی كه دره‌وشانه‌وه‌ی ویسـتی ئه‌زه‌لی و جیلوه‌یه‌كی فه‌رمانی " كُنْ فَيَكُون"یان تێدا ده‌رده‌كه‌وێت.

به‌م جۆره، ئه‌و ده‌سته‌واژانه‌ی قورئـانی پیـرۆز كه هه‌نـدێ جـار جێده‌سـتی قودره‌ت به چه‌شنێك ده‌رده‌خه‌ن كه وه‌ك بڵێیـت له سـیفه‌تی ئیـراده و كه‌لامه‌وه ده‌رچووبن، له‌سه‌ر بناغه‌ی ئه‌م نهێنییه بنیـات نـراون. جـا ئه‌و ده‌سـته‌واژانه‌ی قورئـــان به‌ڵـــگه‌ن له‌ســـه‌ر ئه‌وه‌ی كـــه بـوونه‌وه‌ران به‌وپه‌ڕی خێرایـی به‌دی ده‌هێنرێن و به ته‌واوه‌تی گـوێڕایه‌ڵ و ملكه‌چـی فه‌رمانه‌كـانن، ته‌نـانه‌ت ده‌ڵێـی "ئه‌مر" كتومت وه‌ك "توانست" فه‌رمانه‌كه‌ی جێبه‌جێ ده‌كرێت!

واته ئه‌و پیتانه‌ی كه له فه‌رمانی ته‌كوینییه‌وه هاتوون، وه‌كـو ئه‌وه‌ی هێـزێكی ماددی بن ئاوا كار له بوونی شتاندا ده‌كه‌ن و، "فه‌رمـانی ته‌كـوینی" وه‌ك ئه‌وه‌ی خودی "توانست" و خودی "ئیراده" بێت ئاوا ده‌رده‌كه‌وێت.

به‌ڵـێ، ئه‌م بـوونه‌وه‌ره په‌نهانـانه‌ی كه بـوونه ماددییه‌كه‌یـان له "هه‌وا"دا و له‌وپه‌ڕی په‌نهانیدایه، ته‌نانه‌ت ده‌ڵێـی نیـوه مـاددی و نیـوه مه‌عـنه‌وین، هێنـده ئاسه‌واری ئه‌مـر و ئیراده‌یـان پێـوه دیـاره كه فه‌رمـانی ته‌كـوینی له‌وانـدا وه‌كـو توانست ده‌رده‌كه‌وێت، ته‌نانه‌ت ده‌بێت به خودی ئه‌و توانسته.

به‌م جۆره و بۆ مه‌به‌ستی سه‌رنج ڕاكێشان و هاندانی مـرۆڤ بـۆ بیركـردنه‌وه له‌و بوونه‌وه‌رانه‌ی كه وه‌ك به‌رزه‌خ وان له نێـوان شـتانی مه‌عـنه‌وی و ماددیـدا، قورئان ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (يس:٨٢).

بـۆیه به‌لای ژێـرییه‌وه كـارێكی ته‌واو به‌جێـیه كه ئه‌و پیـته پچڕپچـڕانه‌ی له سـه‌ره‌تای سـووره‌ته‌كاندان، وه‌ك "الم، طـس، حـم" و هاوچه‌شـنیان له په‌رله خواییه‌كان، ببن به چه‌ند "گرێ و دوگمه‌یه‌كی حه‌رفی"ی ئه‌وتۆ كه بتوانن ژێـی په‌یوه‌نـدییه ورد و نادیاره‌كـانی نێـوان گه‌ردیله‌كـانی هه‌وا هێنـده به خێرایـی

بجـوولێنن كە "كـات" لە گۆڕێـدا نەبێـت، بەڵكـو ئەم كـارە لە ئەسـتۆی ئەو پێتـانەدایە و ئەركی سەرشـانیانە كە چەنـدین تەلەگـرافی خـاوێنی وەك بێـتەلی مەعنەوی، لە زەوییەوە بۆ عەرش جێبەجێ بكەن.

بەڵێ، هەموو یەكێك لە گەردیلەكانی"هەوا" تەنـانەت گشـت گەردیلەكـانی ئەو هەوایەی كە بە هەموو هەرێمێكی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، لە ڕێـی بێـتەل و تەلەفۆن و تەلەگرافەوە، فەرمانەكان جێبەجێ دەكەن و دەیانگوێزنەوە. جـگە لە ئەركی گواستنەوەی شتانی بەخوڕەم و نیانی وەكو كارەبا.

من هەر خۆم بە "حەدس"ی[1] بێگومان، بەڵكو بە بینینی ڕاستەقینە، یەكێك لە كارمەندییەكانی تـری جـگە لەوانەی پێشـووی "هەوا"م لەگـوڵە چوالەكانـدا بینی. ئەویش بریتییە لەوەی:

ئەو درەختـانەی كە دەڵێـی سـوپای ڕێكـوپێكن و بە هەمـوو شـوێن و هەرێمێكی زەویدا بڵاوبوونەتەوە، هەمـان "فەرمـان" لە یەك كاتـدا وەردەگـرن. چـونكە هەر تەنهـا بە هەڵكـردنی سروەیەكی نەرم لە ڕێـی ئەو گەردیـلانەوە، فەرمان وەردەگرن و بارودۆخێكی دیاریكراو دەگرنە خۆیـان. كە ئەم حـاڵەتەش دڵنیایی و قەناعەتێكی تەواوەتیی پێ بەخشیم.

واتە ئەو هەوایەی كە لە ڕووی زەویدا بە وێنەی خزمەتگوزارێكی دەستپاك و چالاك و كـارامە ڕادەپەڕێـت و خـزمەتی میوانەكـانی خواوەنـدی بەخشـندەی میهرەبان دەكات كە لە ڕووی زەویدا نیشتەجێ بوون، هەر لە هەمان كاتـدا و لە ڕێی گەردیلەكانیەوە، كە وەكو بێتەل وان، فەرمانەكانی خوای گەورەی میهرەبان بە ڕووەك و زینـدەوەران دەگەیەنێـت، بە جۆرێـك كە گشـت گەردیلەكـانی لە حوكمی خزمەتگـوزارەكانی ئەو فەرمـانەدا دەبـن و، بە وێـنەی مـایكرۆفۆنی

---

(١) حەدس، لە زمـانی عەرەبیـدا واتە: گومـان و دوودڵـی. بەڵام وەك زاراوەیەكی مەنتیقـی - كە لێرەدا ئەوە مەبەستە - واتە: خێرایی زەینی مرۆڤ لە تێگەیشتندا. (وەرگێڕ)

بێتەل و تەلەفۆن خۆیان دەنوێنن. ئنجا هەر لە هەمان کاتیشدا و بە فەرمانی "کُنْ" گەلێ ئەرکی مەزن و کارمەندیی ڕێکوپێکی تر ئەنجام دەدەن، وەك:

پێکهێنانی پیتەکان لە دەمدا، دوای دەرچوونی هەوا لە دەمی مرۆڤدا و، وەك هەواگۆڕینی هەناسەدان و حەواندنەوەی دەروونەکان. واتە دوای ئەنجامدانی ئەرکی پاڵفتەکردنی ئەو خوێنەی کە مایەی ژیانە و، داگیرساندنی گەرمیی غەریزی (سروشتی) کە سووتەمەنیی ژیانە، هەوا لە دەم دێتە دەرەوە و دەبێت بە مایەی دەربڕین و دەرچوونی پیتەکان. بەم جۆرە گەلێ ئەرکی زۆری تر بە فەرمانی " کُنْ فَیَکُون" جێبەجێ دەکات.

جا لەسەر بناغەی ئەم تایبەتکارییەی هەوا، پیتەکان کە چەند بوونەوەرێکی "هەوایی"ن، تا خاوێنیی زیاتر بەدەست بهێنن، واتە تاکو بارودۆخی پەخش و وەرگرتن "البث والإلتقاط" بگرنەخۆ، بەشێکی زیاتریان لەو تایبەتکارییە ناوبراوە دەست دەکەوێت.

جا لەبەر ئەوەی پیتەکانی قورئان لە حوکمی گرێ و دوگمەدان و، پیتە لێکپچڕاوەکانیش لە حوکمی مەڵبەندی ئەو موناسەبەتە نادیارانە و لە حوکمی گرێ و دوگمە هەستیارەکانیاندان، ئەوا وجوودی هەوایی ئەم پیتانە (واتە کاتێ کە لە هەوادان) خاوەنی ئەم تایبەتکارییە ناوبراوە دەبن. هەروەك وجوودی "زیهنی" و وجوودی "نەخشونیگار"یشیان بەشێکیان لەو تایبەتکارییە هەیە.

واتە دەگونجێ بە خوێندنەوە و نووسینی ئەو پیتانە شیفای وەك هی دەرمانی ماددی بە دەست بهێنرێت و، گەلێ مەبەستی تریش دەست بخرێن!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# وشەکانی خوای گەورە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ لَوْ كانَ الْبَحْرُ مِداداً لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً﴾ (الكهف:١٠٩)

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەریایەکی فراوان و بەرز و پڕ لە گەوهەر و مرواریيە. نووسینی باسی گەوهەرە بەنرخەکانی پێویستی بە یەك بەرگی گەورە دەبێت. بۆیە ئەم کارە - پشت بەخوا - بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین.
جارێکیان دوای زیکرەکانی نوێژ، کە باشترین کاتی ئامادەبوونی حەقیقەتەکانە، یەك تیشکی سەرنجێك لە سەرنجە وردەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەم لێ دەرکەوت و سەرنجی ڕاکێشام. بەڵام لە کاتی خۆیدا نەمتوانی ئەو سەرنجە تۆمار بکەم و، ئەو تیشکەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دوور دەکەوێتەوە. وا لێرەدا چەند "وشە"یەك باس دەکەین تاکو چەند بازنەیەك بە دەوری ئەو تیشکەدا بگێڕین و یەکێك لە جیلوەکانی ڕاو بکەین، پێش ئەوەی بە تەواوەتی لە پێش‌چاودا ون ببێت.

**وشەی یەکەم:**

"گوفتاری ئەزەلی" بە وێنەی "زانست" و "توانست" سیفەتی خواوەندە، بۆیە بێ سنوور و نەبڕاوەیە. خۆ هەر شتێکیش کۆتایی پێ نەیەت، هەرگیز تەواو نابێت، تەنانەت گەر هەموو دەریاش ببێت بە مەرەکەبی نووسینی!

**وشەی دووهەم:**

ئاشـكراترین شـت كە "بـوون"ی كەسـێك دەربخـات و ڕایبگەیەنێـت: قسـەكردنیەتی! چـونكە بەهێزتـرین ئاسـەوارە كە دەبێـت بە بەڵـگە لەسـەر ئەو كەسە. ئەوەتا بیستنی هەر "گوفتار"ێك لە هەر كەسێكەوە، لە هەزار بەڵگە زیاتر بەڵكو بە ئەندازەی "پلەی شهوود" بـوونی ئەو كەسـە دەچەسـپێنێت! بـۆیە ئەم ئایەتە پیرۆزە بە "واتا ئاماژەیی"یەكەی خۆی دەفەرموێت: (ئەگەر دەریا ببێـت بە مەرەكەب و ئەو گوفتارانەی پەروەردگاریان پێ بژمێررێـت كە بەڵـگەن لەسـەر "بوون"ی خواوەند و، درەختەكانیش ببن بە قەڵەم و ئەو ژمارانە بنووسن، هێشتا هەر گوفتـاری پەروەردگـارم تەواو نابێـت). واتە ئەو بەڵگـانەی كە لەمەڕ هـی گوفتارن لەسەر "قسەكەر" و بەڵگەن لە سەر خواوەندی تەنیا و صەمەد، هێنـدە زۆرن كە لە ژماردن نایەن و لە سنووریش تێپەڕ دەبـن، بـا هەمـوو دەریاكـانیش مەرەكەبی نووسین و ژماردنیان بن.

**وشەی سێهەم:**

مادەم قورئـانی پیـرۆز هەمـوو چـین و توێژەكـانی گـرۆی مـرۆڤ بـۆ لای "ڕاستییەكانی ئیمان" ڕێنمایی دەكـات، ئەوا بە ڕواڵەت تەنهـا یەك "حەقـیقەت" چەندین جـار دووپـات دەكـاتەوە، چـونكە ئەو حەقـیقەتە داخـوازی ئەوەیە لە دڵاندا بچەسپێنرێت و لە بیر و قەناعەتی خەڵكیشدا بە گشتی جێگیـر بكرێـت. لەبەر ئەوە، ئەم ئـایەتە پیـرۆزە وەڵامـێكی ناوەكی(ضـیمنی)یە بـۆ زانایـانی جوولەكەی ئەهـلی كیتـابی ئەو ڕۆژگـارە، كە بە چەشـنێكی نـاڕەوا ستەمێكی ئاشـــكرایان لە پێغەمـبەر ﷺ دەكـرد و ئیعتیرازیـــان لە نەخوێنـدەوارییەكەی دەگرت و بە كەمیی زانیاری ناوزەدیان دەكرد.

ئەوەتا ئایەتەكە دەفەرموێت:

دووپـاتكردنەوەی ئەو مەسـەلە گەورە و مەزنـانەی كە هەریەكەیـان نـرخ و بەهـای هەزار مەسـەلەیان هەیە و هەزاران حەقیقەتیـان لەخـۆ گرتـووە، وەك

مەسەلەكانی "پایەكانی ئیمان" كە بە چەشنێكی ئیعجازبەخش و بە چەندین شێوازی جۆراوجۆر دووپات دەبنەوە..

هەروەها دووپاتكردنەوەی تەنها یەك حەقیقەت كە لە ڕووی سوودە جۆراوجۆرەكانیەوە، گەلێ بەرهەم و ئاكامی زۆری هەیە، لە پێناوی چەسپاندنی ئەو ڕاستییانەدایە لە دڵی سەرجەمی خەڵكیدا، بە تایبەت توێژی عەوام..

ئەم دووپاتبوونەوەیەی كە چەندین حیكمەتی زۆری وەك چەسپاندن و، قەناعەتبەخشین و، لێكۆڵینەوە داخوازی دەبن، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت كە گوفتاری خواوەند لە چوارچێوەیەكی تەسكدایە، هەروەها هەرگیز هی قسووری زەین و كەمیی توێشوو و دەستكورتی نییە (وەك ئەوەی لە بەرهەمەكانی مرۆڤدا بەدی دەكرێت) بەڵكو ئەگەر هەموو دەریاكان مەرەكەب بن و خاوەن هەستەكانیش نووسەر بن و ڕووەكەكانیش پێنووس بن، تەنانەت ئەگەر سەرجەمی گەردیلەكانیش ببن بە نووكی قەڵەم و، هەر هەموویان وشەكانی گوفتاری ئەزەلیی خواوەند بنووسن و بیانژمێرن ئەوا هەرگیز ئەو وشانە تەواو نابن! چونكە هەموو ئەو شتانەی كە باس كران كۆتاییان پێ دێت. كەچی وشەكانی خواوەند كۆتاییان پێ نایەت و، ئەو سەرچاوەیەن كە قورئانی پیرۆزیان لێ هەڵقوڵاوە و، لە جیهانی غەیبەوە ڕووەو جیهانی بینراو هاتووە و، گوفتاری ئاراستەی جینیی وئادەمیزاد و مەلائیكەت و ڕۆحانییات كردووە، كە لە گوێی هەموو تاكێكی ئەواندا دەزرنگێتەوە. ئەمەش سەیر نییە، چونكە قورئانی پیرۆز لە گەنجینەی ئەو گوفتارە ئیلاهییەوە نازڵ بووە كە هەرگیز تەواو نابێت.

**وشەی چوارەم:**

ئاشكرایە كە دەرچوونی "گوفتار" لە شتێكەوە كە چاوەڕوانی قسە و ئاخاوتنی لێ نەكرێت، گرنگی بەو گوفتارە دەدات و مرۆڤ بۆ بیستنی هان

دەدات، بە تایبەت ئەو زایەڵانەی کە لە گوفتار دەچن و لە تەنە گەورەکانی وەك هەور و بەرزایی ئاسمانەوە دەردەچن. ئەمانە وا لە هەموو کەسێك دەکەن کە بە گرنگی پێدانەوە گوێیان لێ ڕابگرێت، بە تایبەت ئەو ئاوازانەی کە ئامێرێکی گەورەی بە قەد چیا دەریاندەکات، ئەوانە زیاتر سەرنجی گوێکان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. بە تایبەتی زایەڵەی ئاسمانیی قورئان کە بە ڕادیۆ پەخش دەکرێت و ئاسمانە بەرزەکانی پێ دەزرنگێتەوە و، تەنانەت سەری گۆی زەویش بەو گەورەییەی دەبیستێت. ئەوەتا گەردیلەکانی هەوا وەکو مایکرۆفۆن و مەڵبەندی پەخشی ئەو پیتانەی قورئانیان لێ دێت و، بە وێنەی ئاوێنەی ڕووناکیدەرەوە و گوێی بیسەری زایەڵەکان دەردەکەون و، وەکو چەند زمانێکیان لێ دێت کە بەو پیتانە زیکر بکەن. تەنانەت دەڵێی نووکی چەندین دەرزیی ئامێرێکی گرامفۆنی گەورەن و ئەو دەنگانە دەردەکەن.

کەواتە ئەم ئایەتە - بە هێما - مەودای گرنگیی پیتەکانی قورئان و ڕادەی نرخ و بەهای تایبەتکارییەکانیان دەردەخات و، پیشانی دەدات کە ئەو پیتانە زیندوون و دارای ژیانن. ئەوەتا ئەم ئایەتە بە "واتای ئاماژەیی" دەفەرموێت:

قورئانی پیرۆز - کە گوفتاری خواوەندە - زیندووە و سەرتاپا حەیەوییەتی لێ هەڵدەقوڵێت و، هێندەش بەرز و بەنرخە کە ژمارەی ئەوگوێیانەی گوێی بۆ ڕادەگرن و ژمارەی ئەو وشە خاوێنانەش کە دەچنە ناو ئەو گوێیانەوە، هەرگیز تەواو نابن. تەنانەت ئەگەر هەموو دەریاکان ببن بە مەرەکەب و، مەلائیکەتەکانیش ببن بە نووسەر و، گەردیلەکان ببن بە نوختە و، ڕووەکان و مووەکانیش ببنە قەڵەم و پێنووسی ئەو وشانە، هێشتا هەر کۆتاییان پێ نایەت!

بەڵێ، ئەو وشانە هەرگیز تەواو نابن، چونکە ئەوەتا خوای گەورە ژمارەی گوفتارە بێگیان و دوور لە ژیانەکانی "مرۆڤی لاواز" لە هەوادا زۆر دەکات و تا ملیۆنەها دانەیان لەبەر دەنووسێتەوە. ئەی ئایا دەبێ ژمارەی هەموو وشەیەکی زیندووی خۆی کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە چۆن بێت، کە بێ

هاوبەشـە و گوفتارەکانیشـی ڕووی لە هەمـوو خـاوەن هەسـت و نەسـتێکی زەوی و ئاسمانەکانە؟

**وشەی پێنجەم:**

کە بریتییە لە دوو پیت:

پیتی یەکەم: هەروەك سـیفەتی "گوفتـار" دارای چەنـدین وشـەیە، سـیفەتی "توانست"یش خاوەنی چەندین وشەی بەرجەستەیە و، سـیفەتی "زانسـت"یش گەلێ وشەی حەکیمی "قەدەری"ی هەیە کە بریتین لە "بوونەوەران" بە تـایبەتی "زیندەوەران" و، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەتی "بەدیهاتووە بچووکەکـان". چـونکە هەموو یەکێك لەوانە وشەیەکی پەروەردگاریی ئەوتـۆیە ئامـاژەیەکی بەهێزتـر لە ئاماژەی گوفتار دەکات بۆ قسەبێژی ئەزەلی!

جا ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە دەکات بۆ ئەم واتایە کە:

ژماردنی ئەندازەی ئەو بەدیهاتووانە، کارێکە هەرگیز تەواو نابێت، تەنـانەت ئەگەر دەریاکانیش مەرەکەبی نووسین و ژماردنیان بن!

پیتـی دووهەم: هەمـوو جۆرەکـانی ئەو ئیلهامـانەی کە بـۆ مەلائـیکەت و ئادەمیزاد و تەنانەت بۆ زیندەوەرانیش دێن، جۆرێکن لە گوفتاری خواوەند.

خۆ بێ هیچ گومانێك وشەکانی ئەم گوفتارەش بێکۆتـایین. جـا ئەم ئـایەتە پیرۆزە هەواڵی مەودای زۆری و نەبڕاوەیی ژمارەی وشەکانی ئیلهـام و فەرمـانی خواوەنـدمان دەداتـێ کە هەمیشـە سـەربازە لەژمارەبەدەرەکـانی پەروەردگـاری ئاسمانەکان و زەوی، ئیلهامیان لێ وەردەگرن.

والعِلْمُ عِنْدَ اللّهِ.. ولايعلَمُ الغَيْبَ إلاّ اللّهُ.

* * *

# دابەزاندنی ئاسن

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ (الحديد:٢٥)

**وەڵامێکی پوخت و یەکجار گرنگە بۆ پرسیارێك کە تـایبەتە بەم ئایەتەوە و، کەسێکی گرنگ ئاراستەی کردووە کە خاوەنی زانستێکی فراوانە و، هەندێ لە زانایانیشی پێ ئیلزام داوە.**

**پرسیار:**

دەوترێت: ئاسن لە زەوی دەردەهێنرێت و لە ئاسمانەوە نایەتە خـوارەوە تـا بوترێت: ﴿أَنْزَلْنا﴾.. ئەی بۆچی قورئانی پیرۆز نەیفەرموو: "أَخْرَجْنـا" لە بریـی ﴿أَنْزَلْنا﴾ کە بە ڕواڵەت لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوە؟!

**وەڵام:**

قورئانی پیرۆز بۆیە وشەی ﴿أَنْزَلْنا﴾ی بەکارهێناوە تاکو خەڵکی بـۆ لایەنی ئەو نیعمەتە مەزنە بێدار بکاتەوە کە لە ئاسندا هەیە و لە ژیاندا دارای گرنگییە.

واتە قورئـانی پیـرۆز سـەرنجی خەڵـکی بـۆ لای خـودی مـاددەی ئاسـن ڕاناکێشێت تابڵێت: "أخرجنـا" بەڵکـو دەفەرموێـت: ﴿أَنْزَلْنـا﴾ تـاکو بێـداریان بکـاتەوە بـۆ ئەو نـیعمەتە مەزنەی کە لە ئاسـندا هەیە و، بـۆ مەودای ئەو پێویستییەش ڕێنماییان بکات کە مرۆڤ بە ئاسن هەیەتی.

جا لەبەر ئەوەی "نیعمەت" لە ژێـرەوە نـایەتە دەرەوە بەرەو سـەر، بەڵكـو لە گەنجینەی میهـرەبـانییەوە دێـت، كە بێگومـان ئەم گەنجیـنەی میهرەبـانییەش بەرزە و لە ناوەرۆكدا دارای پلەیەكی بڵند و باڵایە، ئەوا "نیعمەت" لە بەرزاییەوە بەرەو خوارەوە نازڵ دەبێت و، پلەی مرۆڤیش - كە موحتـاجی ئەو نـیعمەتەیە - بێگومان لە خوار پلەی ئەو نـیعمەتەوەیە و، "نیعمەتبەخشـین"یش لە سـەرووی "موحتاجی"یەوەیە. لەبەر ئەوە، تەعبیری ڕاست و دروست بۆ دەربڕینی هـاتنی نیعمەت لە لایەن میهرەبانیی خواوەندەوە بۆ فریـاگوزاریی موحتـاجیی مـرۆڤ ﴿أَنْزَلْنا﴾یە نەك "أخرجنا"!

ئنجا لەبەر ئەوەی دەرهێنانی تەدریجیی ئاسن لەسەر دەستی مرۆڤدا ئەنجام دەدرێـت، ئەوا وشـەی "إخـراج" لایەنی نـیعمەت ناخـاتە هەسـتی مـرۆڤ و پێش‌چاوی هەستی بێئاگایان.

بەڵێ، ئەگەر مەبەست ماددەی ئاسـن بـوایە، ئەوا بەپێـی جێگـای مـاددیی ئاسـن دەربڕینـی مەبەسـت بە "إخـراج" كـارێكی شـیاو دەبـوو. بەڵام لێـرەدا مەبەست سیفەتەكانی ئاسن و نیعمەتەكـانی ئاسـنە، كە دوو شـتی مەعـنەوین. بۆیە ئەم واتایە ڕووی لە شوێنی ماددیی ئاسن نیـیە، بەڵكـو ڕووی لە پـلەوپـایە مەعنەوییەكەیەتی.

ئەو نیعمەتە كە لە گەنجینەی "میهرەبانی"یەوە دێت، كە ئەویـش یەكـێكە لە درەوشانەوەكانی پلەوپایەی بەرزی خواوەندی میهرەبان، ئەو نیعمەتە بـێ هـیچ گومانێك لە بەرزترین پلەوە بەرەو خوارەوە ڕەوانە دەكرێت.

كەواتە گوزارشتی ڕاست و دروست بۆ دەربڕینی ئەم مەبەستە ﴿أَنْزَلْنا﴾یە.

هەروەها قورئانی پیرۆز بەم دەربڕینە مرۆڤ بۆ ئەو ڕاستییە بێـدار دەكـاتەوە كە ئاسن نیعمەتێكی گەورەی خواوەندە.

بەڵێ، ئاسن مایەی سـەرهەڵدانی گشـت تەكنۆلۆژیـای گـرۆی مـرۆڤ و، سەرچاوەی هەموو پێشكەوتن و تەوەرەی سەرجەم هێزەكانیەتی.

جـا لەبەر یادخســتنەوەی ئەم نــیعمەتە مەزنە، قورئــانی پیــرۆز بەوپەڕی گەورەیــی و ســام و هەیــبەتەوە و لە مەقــامی منەتلێنــان و نیعمەتبەخشــیندا، دەفەرموێت: ﴿وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾..

هەروەك گەورەترین موعجیزەی حەزرەتی داوودیش - دروودی لەسەر بێت - بە ﴿وَأَلَنَّا لَـهُ الْحَدِيـدَ﴾ دەردەبڕێــت. واتە دەریــدەخات کە نەرمکــردنی ئاســن مــوعجیزەیەکی گەورە و نیعمەتــێکی مەزن بــووە کە بە پێغەمــبەرێکی گەورەی بەخشیوە.

دووهەم:

"سەر" و "خوار" دوو گوزارشتی نیسبین و، ســەبارەت بە مەڵبەنــدی گــۆی زەویــن. تەنــانەت ئەوەی کە ســەبارەت بە ئــێمە بە "لای خــوارەوە" دادەنرێــت سەبارەت بە کیشوەری ئەمریکا "لای سەرەوە"یە! واتە.بارودۆخی ئەو ماددانەی کە لەناو مەڵبەندی زەوییەوە دێنە سەر ڕووی زەوی، ســەبارەت بە دانیشــتووانی ڕووی دەرەوەی زەوی، دەگۆڕین.

قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی بەیان بە زمانی ئیعجازەکەی دەفەرموێ:

ئاسن گەلێ سوودی زۆر و فــراوانی هەیە، بە ڕادەیەك کە نــابێ وا بزانرێــت کــانزایەکی سروشــتیی وەهــایە هەرچۆنێــك بە دەســتەوە هــات بەو جــۆرە لە پێداویستییەکاندا بەکــار دێــت، بەڵکــو دەریــدەخات کە نیعمەتــێکی گەورەیە و بەدیهێنەری گەردوون بە ســیفەتی شــکۆداری ﴿رَبُّ السَّمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ و لە گەنجیــنەی میهرەبــانیی خــۆیەوە هێنــاویەتە خــوار و، لە کــارگەی گەورەی گەردوونیشدا ئامادەی کــردووە، تــاکو ببێــت بە خــولگە و تەوەرەی جێــبەجــێ بــوونی پێویســتییەکانی دانیشــتووانی زەوی. بــۆیە تەعبیــری "نــازڵکردنی" بــۆ بەکارهێنا و فەرمووی: ﴿وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ﴾ تاکو ئەو سوودە گشتییانە دەربخــات کە لە ئاســـندا هەن، بە وێـــنەی ســـوودەکانی "جــووڵە" و "ڕوونــاکی" کە لە ئاسمانەوە دێن و لە کارگەی گەردوونەوە ڕەوانە دەکرێن.

کەواتە "ئاسن" لە گەنجینە بچووك و بەرتەسکەکانی گۆی زەوییەوە دەرناچێت، بەڵکو لە گەنجینەی میهرەبانییەوە دێت کە ئەویش لە کۆشکی گەورەی گەردووندایە و پاشان نێرراوە بۆ زەوی و لە گەنجینەکانیدا دانراوە، تاکو وردە وردە و بەپێی پێداویستیی چەرخ و سەردەمەکان بتوانرێت دەربهێنرێت و سوودی لێ وەربگیرێت.

واتە مەبەستی قورئانی پیرۆز ڕوونکردنەوەی ئەم دەرهێنانە تەدریجییەی ئاسن نییە لەم گەنجینە بچووکەی زەویدا، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە دەریبخات ئەو نیعمەتە مەزنە پێکەوە لەگەڵ گۆی زەویدا لە گەنجینەی مەزنی گەردوونەوە نازڵ کراوە، بۆ ئەوەی ئاشکرای بکات کە ئاسن لە هەموو شتێك پێویستترە بۆ گەنجینەی زەوی، بە ڕادەیەك کە بەدیهێنەری شکۆمەند کاتێ زەویی لە خۆر جیا کردەوە ئاسنیشی لەگەڵدا ناردە خوارەوە تاکو زۆربەی پێداویستییەکانی مرۆڤ دابین بکات و بیانهێنێتەدی. کەواتە قورئانی حەکیم، لە ڕێی ئیعجازەکەیەوە، ئەم واتایە بە مرۆڤ ڕادەگەیەنێت کە:

کارەکانتان بەم ئاسنە ڕاپەڕێنن و، هەوڵ بدەن بە دەرهێنانی لەناو زەویدا سوودي لێ وەربگرن.

ئەم ئایەتە مەزنە، دوو جۆر لەو نیعمەتانە دەردەخات کە تەوەرەی "دوورخستنەوەی دوژمن" و "نزیکخستنەوەی سوودەکان"ن.

پێش نازڵبوونی قورئان سوودە گرنگەکانی ئاسن بۆ گرۆی مرۆڤ هاتبوونەدی و بە چاو بینرابوون، بەڵام قورئان دەریدەخات کە لە دواڕۆژدا ئاسن چەند شێوەیەکی ئەوتۆ دەگرێتە خۆی کە کەسانی ژیر و هۆشمەند سەرسام بکات و، بە ناو دەریا و هەوا و وشکانیدا بڕوات و، تەنانەت زەوی ژێربار و تەسخیر دەکات و، هێزێکی هێندە دەراسا دەردەخات کە هەڕەشەی مردن لە مرۆڤ بکات. قورئان ئەمەشی بە: ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ دەربڕیوە و، بەمەش بریسکەیەکی ئیعجازی لە هەواڵدانێکی غەیبیدا دەرخستووە.

کاتێ دەرگای باس لەسەر ئەو سەرنجەی پێشوو خرایە سەر پشت، دەرگای قسەش لەسەر "پەپوو"ی حەزرەتی سولەیمان کرایەوە و، یەکێك لە براکانمان، کە زۆر لە پرسیارکردندا پێ دادەگرێت[1]، دەپرسێت:

پەپووسلێمانە بە ﴿يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمٰوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (النمل:٢٥) وەسفی بەدیهێنەری بەخشندە دەکات. ئایا هۆی چییە لەم مەقامە مەزنەدا ئەم وەسفەی باس کردووە کە لە چاو وەسفە مەزن و شکۆمەندەکاندا وەسفێکی ناسك و نیانە؟

**وەڵام:**

یەکێك لە تایبەتکارییەکانی "گوفتاری ڕەوان" ئەوەیە کە ئەو سنعەتەی خاوەن گوفتار پێیەوە خەریکە، بیخاتە هەست و نەستی گوێبیستەوە.

جا پەپووی حەزرەتی سولەیمانیش، کە بە وێنەی دەشتەکیی شارەزا، ڕێشناس و شارەزای نێوان باڵندە و زیندەوەرانە و، بە فیراسەتێکی وەکو کەرامەت لە دوورگەی کەم ئاوی عەرەبدا شوێنە پەنهانەکانی ئاو دەدۆزێتەوە. ئەم باڵندە بەفەڕ و پیرۆزە، ئەرکی ئەندازیاری و کاری دۆزینەوەی ئاوی لە خزمەت حەزرەتی سولەیماندا - دروودی خوای لەسەر بێت - خرابووە ئەستۆ. بۆیە بە پێوەری سنعەتە وردەکەی خۆی، ئەوە دەچەسپێنێت کە هەر تەنها خوای گەورە شایانی پەرستن و سوژدە بۆ بردنە. چونکە ئەو خواوەندەیە کە شتانی پەنهانی ناو زەوی و ئاسمانەکان دەردەهێنێت و دەیانخاتە ڕوو..

دەبینیت لە ڕێی سنعەت و کارە وردەکەی خۆیەوە ئەم ڕاستییە دەچەسپێنێت!

جا ئەم بۆڕوانینەی پەپووسلێمانە گەلێ جوانە! چونکە سروشتی کانزا و ناوك و تۆوە لەژمارەبەدەرەکانی ژێر گڵ داخوازی ئەوە نییە کە لە ژێرەوە بۆ

(١) مەبەست "ڕەئفەت"ە، کە لە پرسیارکردندا زۆر بەغیرەتە و، کەچی لە نووسینەوەی پەیامەکانیشدا سستی و تەمبەڵی دەنوێنێت! (دانەر)

سەرەوە بێنە دەرەوە، چونکە تەنە قورسەکان کە خاوەنی گیـان و دارای ئیختیـار نین، لە خۆیانەوە بەرەو لای ژوورروو سەر نـاکەون، بەڵکـو لای ژوورەوە بەرەو خوارەوە دادەکەون..

کەواتە دەرهێنانی تەنێکی پەنهانی ژێر گڵ لە ژێرەوە بۆ سەرەوە و تەکانـدنی ئەو گـڵە زەبەلاحەی سـەر شـانی بێگیـان و هەسـتی ئەو، دەبێـت لە ڕێـی توانستێکی دەراساوە بێت، نەك لە لایەنی خۆیەوە.

جـا پەپـووسـڵێمانە لە ڕێـی شـارەزاییەوە لە کارەکەیـدا، پەنهـانترینی ئەو بەڵگـانەی دۆزیـوەتەوە کە دەیـچەسـپێنن هەر تەنهـا خواوەنـد پەرسـتراو و سوژدەبۆبراوی ڕاستەقینەیە. ئیتر لە ڕێی سـنعەتەکەی خـۆیەوە گرنگترینـی ئەو بەڵگانەی دۆزیوەتەوە.

قورئانی حەکیمیش ئیعجازێکی ئەوتۆی پێ بەخشراوە کە تەعبیر لەم حاڵ و گوفتارەی پەپووسڵێمانە بکات!

* * *

# دابەزاندنی ماڵات

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ الأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاثٍ﴾ (الزمر:٦)

ئەم ئایەتە پیرۆزە، هەمـان سـەرنجی لەخـۆ گرتـووە کە لە ئـایەتی پیـرۆزی ﴿وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيـدَ﴾دا ڕوونمان کردەوە. کەواتە ئەمیش پشتی ئەو دەگرێت و، لە هەمان کاتیشدا بەو بەهێز و پتەوتر دەبێت.

بەڵێ، قورئانی پیرۆز لە سوورەتی "زُمَر"دا دەفەرموێـت: ﴿وَأَنْـزَلَ لَكُـمْ مِـنَ الأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ﴾ کەچـی نافەرموێـت: "وخلَـقَ لكـم مـن الأنعـام ثمانيـةَ أزواج"، تاکو ئەوە بگەیەنێت کە:

هەشت جووت ئاژەڵی بەپیت و بەفەڕتان بۆ نـازڵ کـراوە و، لە گەنجینـەی میهرەبانیی خواوەندەوە بۆتان نێرراوە، وەك بڵێی لە بەهەشتەوە ڕەوانە کرابن.

چـونکە ئەو ئـاژەڵە بەفەڕ و بەپیتـانە لە هەمـوو ڕوویەکیـانەوە نـیعمەتن بـۆ سەرجەمی گرۆی مـرۆڤ. ئەوەتـا دەشـتەکییەکان سـوود لە خـوری و مـووی ئاژەڵەکان وەردەگرن، چ بۆ نیشـتەجێبـوون و چ بـۆ گەشـتوگوزاریان. هەر لەو خوریـیـانەش بەرگ و پۆشـاك دەچنرێـت و، لە گۆشتەکانیشـیان خۆشـترین خـواردەمەنی ئامـادە دەکرێـت و، لە شیرەکانیشـیان خۆشـترین خـۆراك دەردەهێنرێـت و، لە پێستەکانیشـیان سـەرپێیی(نەعل) و پـێڵاو و مـاددەی

سوودبەخشی تر دروست دەكرێن. تەنانەت پاشـەڕۆی ئەو ئـاژەڵانە دەبێـت بە ڕۆزیی ڕووەك و جۆرە سووتەمەنییەكیش بۆ مرۆڤ..

دەڵێی ئەو ئاژەڵە بەفەڕ و بەپیتانە، خودی نیعمەت و میهرەبانین و بەرجەستە بوون، بۆیە ناوی "الأنعام"یان بەسەردا بڕراوە! وەكو ئەوەی نـاوی "الرحمـة" لە باران نرا. وەك بڵێی "میهرەبـانی" بەرجەسـتە بـووە و شـێوەی "بـاران"ی لەخـۆ گرتووە و، "نیعمەت"یش لە چەند شێوەیەكی جیاجیا و شكڵ و وێـنەی "بـزن و مەڕ و مانگا و گامێش و حوشتر"دا بەرجەستە بووە!

خۆ هەرچەنـدە مـاددە جیسـمانییەكانیان لە زەویـدا بەدی دەهێـنرێن، بەڵام سیفەتی نیعمەت و واتـای "میهرەبـانی" بەسـەر ماددەكەیانـدا زاڵ بـووە، بـۆیە قورئانی پیرۆز بە ﴿أَنزَلْنَا﴾ تەعبیری لێ كـردن، كە ئەوە دەگەیەنێـت بەدیهێـنەر ئەم ئاژەڵە بەپیت و بەفەڕانەی ڕاستەوخۆ لە گەنجینەی میهرەبـانییەوە نـاردووە، واتە بەدیهێنەری میهرەبان لە پلەی میهرەبـانییە بڵنـد و فـراوانەكەی و بەهەشـتە مەعنەوییە بەرزەكەیەوە و، بەبێ هـیچ هۆكارێـك، بە دیـاری بـۆ ڕووی زەویـی ناردوون.

بەڵێ، هەندێ جار سنعەتێكی پێنج لیرەیی لەناو ماددەیەكـدا دادەنرێـت كە پێنج قرووش ناهێنێت. كەواتە لەم كاتەدا ماددەی شتەكە ڕەچاو ناكرێت، بەڵكو گرنگی بە سنعەتەكەی نـاوی دەدرێـت، بە وێـنەی ئەو سـنعەتە پەروەردگـارییە مەزنەی كە لە جەستەی بچووكی مێشدا هەیە. هەندێ جاری تریش سنعەتێكی هەرزان لەناو مـاددەیەكی بەنرخـدا دەبێـت، ئەو كـاتەش حـوكم بـۆ مـاددەكە دەبێت.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، هەنـدێ جـار مـاددەیەكی جەسـتەیی، هێنـدە واتای زۆری "میهرەبانی" و"نیعمەت" لە خـۆدا هەڵـدەگرێت كە سـەد هێنـدەی ماددەكە دارای گرنگی بن. وەك بڵێی ماددەكەی ئەو شتە، لە بەردەم گەورەیی و

گرنگیی نیعمەت و میهرەبانیدا، لە بەرچاودا ون دەبێت وخۆی دەشارێتەوە، بۆیە لێرەدا ڕووی حوکمەکە لەو شوێنەیە کە نیعمەتی تێدا ڕەچاو کراوە.

ئنجا هەروەك سووده گەورە و زۆرەکانی ئاسن، ماددە بەرجەستە و ماددییەکەی دادەپۆشن، بە هەمان جۆر ئەو نیعمەتەش کە لە هەموو بەشێکی ئەم ئاژەڵە بەپیتە ناوبراوانەدا هەیە، دەڵێی "ماددە جیسمانی"یەکەی ئەوانی گۆڕیوە بە "نیعمەت" و ئیتر لەم ڕووەوە سیفەتە مەعنەوییەکانیان ڕەچاو کراوە، نەك ماددە جیسمانییەکەیان. بۆیە لە ئایەتە پیرۆزەکاندا بە ﴿وَأَنزَلَ﴾ و ﴿وَأَنزَلْنَا﴾ تەعبیر کران.

بەڵێ، دەستەواژەی: ﴿وَأَنزَلَ﴾.. ﴿وَأَنزَلْنَا﴾ هەروەك لە ڕووی حەقیقەتەوە ئەم سەرنجانەی پێشوو دەگەیەنن، لە هەمان کاتدا و بە شێوەیەکی ئیعجازبەخش واتایەکی "ڕەوانبێژی"ش دەبەخشن، کە ئەمەی خوارەوەیە:

بەخشینی چەند تایبەتکارییەکی جوداکەرەوە بە "ئاسن" وەك: دەستکەوتنی لە هەموو شوێنێکدا و ئاسانیی نەرمکردنەوەی بە وێنەی هەویر، لە ڕاستیدا نیعمەتێکی خواییە، بە ڕادەیەك کە دەتوانرێت دەستبخرێت و لە هەموو ئیشێکدا بەکاربهێنرێت، هەرچەندەش ماددەیەکی ڕەق و نادیارە و بە سروشت لە قوڵایی زەویدایە.

کەواتە تەعبیرکردن بە ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ﴾ ئەم واتایە دەردەخات. واتە ئاسن نیعمەتێکە وەکو نیعمەتە سروشتییە ئاسمانییەکان کە بە ئاسانی دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت، دەڵێی ماددەی "ئاسن" لە کارگەیەکی بڵند و بەرزەوە دادەبەزێت و بە ئاسانی بە دەستی مرۆڤ دەسپێررێت!

هەروەها ئاژەڵە کەتە و گەورەکانی وەك مانگا و گامێش و حوشتر و بەدیهاتووە زەبەلاحەکانی تر، هەر هەموویان ڕامکراو و گوێڕایەڵ و ملکەچن، تەنانەت بۆ منداڵێکی بچووکیش، چونکە جڵەوی خۆیانی دەدەنە دەست و گوێڕایەڵی دەبن!

بۆیە تەعبیركردن بە ﴿وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ الأَنْعَامِ﴾ ئەوە دەگەیەنێت كە:
ئەم ئاژەڵە بەپیت و بەفەڕانە چەند گیاندارێكی دنیایی ئەوتۆ نین كە خەڵكی لێیان بترسن و زیانمان پێ بگەیەنن، وەك مێشوولە و مار و دووپشك و گورگ و شێر و ئاژەڵە دڕندەكانی تری هاوچەشنیان، بەڵكو چەند ئاژەڵێكی ئەوتۆن كە لە بەهەشتێكی مەعنەوییەوە هاتوون و گەلێ سوودی زۆریان هەیە و هیچ زیانێكیشیان لێ ناوەشێتەوە. تەنانەت دەڵێی لە لای "سەروو"ەوە نازڵ دەبن، واتە لە گەنجینەی میهرەبانییەوە دێن.

لەوانەیە مەبەستی هەندێ لە تەفسیرنووسان كە وتوویانە: "ئەم ئاژەڵانە لە بەهەشتەوە نازڵ بوون"، لەم واتایەوە سەری هەڵدابێت كە باسمان كرد[1].

ئەگەر لاپەڕەیەكی تەواو لەسەر ئەو مەسەلە و سەرنجانە بنووسرێت كە لە تەنها یەك دانە پیتی قورئانی پیرۆزدا هەن، ئەوا هێشتا بە درێژ دانانرێت. كەواتە نووسینی سێ لاپەڕە بۆ ڕوونكردنەوەی سەرنجەكانی دەستەواژەی ﴿أَنْزَلْنَا﴾ی قورئان هەرگیز بە ئیسراف دانانرێت، بەڵكوهەندێ جار تەنها یەك پیتی قورئانی پیرۆز دەبێت بە كلیلێك بۆ گەنجینەیەكی مەعنەویی مەزن.

* * *

---

(١) هەندێ لە تەفسیرنووسان وتوویانە: بنەمای ئەم ئاژەڵانە لە ئاسمانەوە هاتووە. مەبەستیشیان لەمەدا ئەوەیە كە مانەوەی ئەم ئاژەڵانەی پێیان دەوترێت: "الأنعام" تەنها بەندە بە ڕۆزییەوە. ڕۆزییەكانیشیان بریتییە لە گژوگیا و ڕووەكەكان، خۆ ڕۆزیی گژوگیاكانیش لە بارانەوە هاتوون، كە وەك ئاشكرایە بارانیش مایەی ژیانە و میهرەبانییەكە لە ئاسمانەوە نازڵ بووە، كەواتە ڕۆزی لە ئاسمانەوە هاتووە. ئەو ئایەتە پیرۆزەش كە دەفەرموێت: ﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ﴾ (الذاریات:٢٢) ئاماژە بۆ ئەم واتایە دەكات. چونكە مادەم بەردەوامبوونی جەستەی هەمیشە تازەوەبووی زیندەوەران بەو بارانەوە بەندە كە لە ئاسمانەوە نازڵ بووە، ئەوا تەعبیركردن بە: ﴿أَنْزَلْنَا﴾ لە شوێنی شیاوی خۆیدایە. (دانەر)

# دەستوورێك

قوتابییانی نوور لە دەرەوەی بازنەی "پەیامەکانی نوور"دا بە دوای ڕووناکیدا ناگەڕێن و، ناشبێ بگەڕێن! خۆ ئەگەر یەکێکیان لە دەرەوەی ئەو بازنەیە بە دوای ڕووناکیدا بگەڕێت، ئەوا لە بریی ئەو "خۆرە مەعنەوی"یەی کە لە پەنجەرەی پەیامەکانی نوورەوە ڕێی بۆ ڕووناك دەکاتەوە، تەنها "چرا"یەکی ئاسایی دەست دەکەوێت! تەنانەت لەوانەشە خۆرەکەی لەدەست بچێت!!

پاشان ئەو مەشرەبە بێگەردەی "خوللەت" و ئەو ڕێبازە بەهێزەی "برایەتی" کە لە بازنەی پەیامەکانی نووردا هەیە و، بە چەشنێکە چەندین ڕۆحی زۆر دەستی تەنها یەك کەس دەخات و، یەکێك لە نهێنییەکانی ئەو برایەتییە ئاشکرا دەکات کە هاوەڵە بەڕێزەکان لە نووری نبووەتەوە بە میرات بۆیان مایەوە، هیچ پێویستییەك بۆ مرۆڤ ناهێڵێتەوە کە لە دەرەوەی بازنەی "پەیامەکان"دا بە دوای باوك و ڕابەر و پیر و دەستگیردا بگەڕێت، کە ئەمەش لە سێ ڕووەوە زیانی پێدەگەیەنێت. بەڵکو لە بریی تەنها یەك دانە باوك و ڕابەر گەلێ برای گەورەی زۆری بۆ پەیدا دەکات. خۆ بێگومان جۆرەکانی ئەو شەفەقەتانەی کە لە دڵی چەندین برای گەورەوە هەڵقوڵاون، هێندە ئاسوودەیی بە مرۆڤ دەبەخشن کە بە زیادەوە جێی شەفەقەتی تاقە باوکێکی بۆ بگرنەوە.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە پێش هاتنی بۆ ناو بازنەی نوور، شێخ و ڕابەرێکی بۆ خۆی داناوە، دەتوانێت لەناو بازنەی نووریشدا پارێزگاریی پەیوەندییەکانی بە

شێخ و ڕابەرەكەیەوە بكـات، بەڵام هەركەسـێك پـێش هـاتنی بـۆ نـاو بـازنەی پەیامەكان شـێخی نەبووبێـت، بـۆی نیـیە لە دەرەوەی ئەو بـازنەیەدا دەسـت بە شێخێكەوە بگرێت.

پاشان وانەی ڕاستییەكانی پەیامەكانی نوور ئەو زانستی حەقـیقەتەی تێـدایە كە ڕێژنەی "ویـلایەتی كـوبرا" دەبەخشـێت، كە ئەویـش لە نهێنیـی میراتگریـی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵقوڵاوە. خـۆ ئەمەش هـیچ پێویسـتییەك بەوە نـاهێڵێتەوە كە مرۆڤ لە دەرەوەی بازنەی پەیامەكانـدا بچێـتە ڕیـزی تەریـقەتە سـۆفییەكانەوە. مەگەر كەسێك بە ڕاستی و دروستی لە "تەریقەت" نەگەیشتبێت و، پێی وابێـت چەنـد خەو و خەیـاڵێكی خـۆش و ئەنـوار و ئەزواقـێكە و، بیەوێـت چێـژ و ئارەزووەكانی دنیا بەدەست بهێنێت، بێ ئەوەی خـۆی لە قەرەی فەزیلەتەكـانی دواڕۆژ بـدات و، بە وێـنەی خۆپەرسـتان بە دوای پـلەی "مەرجەعیـیەت"دا بگەڕێت. خۆ ئەم دنیایە "خـانەی دانسـت"ە و، پاداشـت تیایـدا بەپێـی ئەرك و ماندووبوونە و، هەرگیز "خانەی پاداشت وەرگرتن" نییە..

بـۆیە حەقیقەتخـوازان بـایەخ بەو چێـژ و نـوورانە نـادەن كە لە كەشـف و كەرامەتدا هەن، بەڵكو لە دەستی هەڵدێن و دەیانەوێت بیانپۆشن.

پاشان بازنەی "پەیامەكانی نوور" یەكجـار فراوانە و قوتابییەكانیشـی تـابڵێی زۆرن. بۆیە بە دوای ئەوانەدا ناگەڕێـت و بایەخیـان پـێ نـادات كە لەو بـازنەیە هەڵدێن، بەڵكو لەوانەیە جارێكی تر نەیانخاتەوە ناو بـازنەكەی خـۆی. چـونكە مـرۆڤ خـاوەنی تەنهـا یەك دڵە و، ئەم تـاقە دڵەش نـاگونجێ لە یەك كاتـدا لە ناوەوە و لە دەرەوەی بازنەكەدا بێت!

پاشان ئەوانەش كە لە دەرەوەی بازنەی نووردا حەزیان لە ڕێنمایی خەڵكییە، با بە قوتابییانی نوورەوە خۆیان خەریك نەكەن، چـونكە نـزیكە لە سـێ ڕووەوە

زیانیان لێ بدەن. خـۆ ئەو قوتابییـانەی کە لە بـازنەی تەقـوادان پێویسـتیان بەو ڕێنماییەی ئەوان نییە، لە کاتێکدا کەسانێکی زۆر هەن لە دەرەوەی بازنەکەدان و وازیـان لە نـوێژ هێنـاوە و پێوسـتییان بە ڕێنمایـیە! جـا وازهێنـان لەوانە و خـۆ سەرقاڵکردن بەم خاوەن تەقوایانەوە، لە ڕاستیدا بە ڕێنمایی دانانرێت..

خۆ ئەگەر ئەو قوتابییانەی خۆش دەوێت، دەبا لە پێشدا خـۆی بچێـتە نـاو بازنەکەیان و ببێت بە برایان، ئنجا ئەگەر خاوەن فەزیلەت و تایبەتکاری بوو، با ببێت بە برای گەورەیان!

لەم ڕووداوەوە دەرکەوت کە پەیوەنـــدیکردن بە پەیامەکـــانی نـــوورەوە گرنگییەکی مەزن و نرخ و بەهایەکی تابڵێی گەورەی هەیە..

جا ئەو مرۆڤە ژیرەی کە ئەم هەمـوو قوربـانییەی داوە و، بە نـاوی جیهـانی ئیسـلامییەوە موجـاهەدەی ئیلحـادی کـردووە، واز لەم ڕێبـازە ناهێنێـت کە لە ئەڵماس بەنرخترە و ناتوانێت بڕواتە ناو ڕێبازێکی ترەوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# بڕگەیەك

## كە لە بەندیخانەی "ئەسكی شەهر"دا نووسرا

برایانم!

گەلێ بەرگریی ئەوتۆم لە قوتابییانی نوور كرد كە شایانی ئەوان بێت. پشت بەخوا لە دادگاشدا بەوپەڕی توانامەوە دەنگی لێ هەڵدەبڕم و، هەمان بەرگرییان لێ دەكەم و، دەنگی پەیامەكانی نوور و پلە و پایەی قوتابییانی بە گوێی سەرانسەری دنیادا دەدەم! بەڵام دەبێ ئاگاتان لەمەی خوارەوە بێت:

مەرجی پارێزگاریكردنی نرخ و بەهای بەرگرییەكەم بریتییە لەوەی كە لە ئەنجامی تەنگانەی ئەم ڕووداوە و هاوچەشنیەوە واز لە پەیامەكانی نوور نەهێنرێت و، برا لە مامۆستاكەی بێزار نەبێت و، بەهۆی تەنگانە و بێزاربوونەوە دووره پەرێزی لە براكانی نەكات و، بە دوای عەیب و عار و ناتەواویی یەكتردا نەگەڕێن.

ئێوە لە یادتانە كە لە "پەیامی قەدەر"دا چەسپاندمان ئەو ستەمەی دێتە ڕێی مرۆڤ دوو حوكم و دوو ڕووی تێدایە:

ڕووی یەكەم: هی مرۆڤە و.. ئەوی تریان: هی قەدەری خوایە.

واتە: لە تەنها یەك ڕووداودا مرۆڤ ستەم دەكات، لە كاتێكدا "قەدەری دادگەر"ی خواوەند لە هەمان ڕووداودا بە دادگەری ڕەفتار دەكات.

جا دەبێ ئێمە لەم كێشەیەماندا زیاتر بیر لە دادگەریی قەدەر و حیكمەتی خواوەند بكەینەوە، تا بیركردنەوەمان لە ستەمی مرۆڤ.

بەڵێ، قەدەر بانگهێشتی قوتابییانی نووری بۆ ئەم كۆڕ و ئەنجومەنە كردووە و، حیكمەتی "سەركەوتنی جیهادی مەعنەوی" بەرەو ئەم قوتابخانە

یووسفییە ئەوانی دایەبەر کە لە ڕاستیدا مرۆڤ دڵتەنـگ و بێـزار دەکـات و، بەو پێیە ستەمی مرۆڤ بوو بەهۆی ئەو کارەی قەدەر. لەبەر ئەوە، هەرگیـز کەسـتان بە کەسی ترتان نەڵێت: "گەر ئاوات نەکردایە من نەدەگیرام"!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# شەرەفی بەرزی پەیامەکان

برایانم!

ئەوەم بە دڵدا هات کە هەروەك "مەسـنەویی ڕۆمـی" بـوو بە ئـاوێنەیەك بـۆ دانەوەی نووری تەنها یەك دانە لەو حەوت حەقیقەتانەی کە لە نـووری خـۆری قورئانی پیـرۆزەوە پرشـنگی داوە و، لەم ڕێـیەوە پـلەوپـایە و شـەرەفمەندییەکی هێندە بەرزی بەدەست هێنا کە بوو بە ڕابەرێکی بەردەوام و نەمر بۆ گەلێ کەس لە "ئەهلی دڵ"، چ جای مەولەوییەکان..

بە هەمان جۆر، "پەیامەکانی نوور"یش - بە ئیـزنی خـوا - لە حەوت ڕووەوە شەرەف و پلە و پایەیەکی بەرز و بڵند بەدەسـت دەهێـنن و، حەوت ئەوەنـدەی مەسنەویی ڕۆمی وەکو ڕابەرێکی نەمـر و پێشـەوای بەردەوامـی لـێ دێـت بـۆ "ئەهلی حەقیقەت". چونکە ئەم پەیامانە هەر حەوت نوورەکانی خۆری قورئانی پیرۆز و حەوت ڕەنگە جیاجیاکـانی ڕوونـاکییەکەی، بە یەك جـار، لە ئـاوێنەی خۆیاندا دەردەخەن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# زللەیەکی میهرەبانی

برایانم!

وا سێ ڕۆژ دەبێت بە قەناعەتێکی تەواو هەستم کردووە ئەمەی کە گرفتاری بووین - بە داخەوە - زللەیەکی میهرەبانییە! تەنانەت ئەم ئایەتەی خوارەوە کە گەلێ ئاماژەی تێدایە، من وای لێ تێگەیشتم یەکێك لە ئاماژەکانی ڕووی لە ئێمە بێت! ئەم ئایەتە پیرۆزە کە ڕووی لەوانەیە بێگوێیی فەرمانی خوا دەکەن دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ... أَخَذْنَاهُمْ﴾[1] واتە: ئەو کەسانەی کە ئامۆژگاری کران، دوای ئەوەی ئامۆژگارییان نەگرتە گوێ، بە گیروگرفت و بەڵا و موسیبەت دووچارمان کردن..

بەڵێ، لەم دواییەدا پەیامێکمان پێ نووسرا کە تایبەتە بە نهێنیی ئیخلاسەوە. بە ڕاستیش پەیامێکی بەرز و دەستوورێکی برایانە و نوورانییە. بە ڕادەیەك کە ئەو گیروگرفت و ڕووداوانەی بە دە هەزار کەس نەبێت ناتوانرێ بەری لێ بگیرێت، کەچی بەهۆی نهێنیی ئیخلاسەوە تەنها دە کەس دەتوانن بەرەنگاریان ببنەوە و خۆیانی لە بەردەمدا ڕابگرن! بەڵام وا بە داخەوە دەڵێم: کە ئێمە و لە پێشدا خۆم، نەمانتوانی بەپێی داخوازی ئەو بێدارکردنەوە مەعنەوییە ڕەفتار بکەین. بۆیە واتای "ئاماژەیی"ی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئێمەی گرتەوە و، هەندێکمان گیرۆدەی زللەی تەمێکردن و میهرەبانی بووین، سەبارەت بە هەندێکی تریشمان

---

(١) دەقی تەواوی ئایەتەکە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ﴾ (الأنعام:٤٤).

زللەی تەمێکـردن نەبـوو، بەڵکـو بـوو بە مـایەی دڵـدانەوە و دڵنەوایـی، تـاکو پاداشتیان دەست بکەوێت.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی ماوەی سێ مانگە تێکەڵبوونم لەگەڵ خەڵك لێ قەدەغە کراوە، ئەوا هەتا سێ ڕۆژ پێش ئێسـتاش نەمتوانیـوە ئاگـام لە هەواڵـی برایـانم بێت. ئەوەبوو بێ ئەوەی شتی وام هەرگیز بە خەیاڵدا هاتبێت:

هەندێ لەوانەی کە بە دڵسۆزترین و خـاوێنترینی برایـانی خـۆمم دادەنـان، چەنـد کـارێکی پـێچەوانەی نهێنیـی ئیخلاسـیان لـێ دەرکەوت. ئیـتر لەمەوە تێگەیشتم کە یەکێك لە واتا ئاماژەییەکانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ... أَخَذْنَاهُمْ﴾ لە دوورەوە ڕووی لە ئێمەیە.

ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە سەبارەت بە گومڕایان نازڵ بـووە، مـایەی ئـازارێکی سـەختە بـۆ ئەوان. بەڵام بـۆ ئـێمە زلـلەیەکی تەمێکـردن و میهرەبـانییە، تـاکو دەروونەکـانی پـێ پەروەردە و گـوناهەکانیشـی پـێ پاکـژ بکـرێن و، پـلە و پایەکانیشی پێ بەرز ببنەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئێمە ڕێزی شایانمان لەو نیعمەتە خواییە بەنـرخە نەنا کە پێی بەخشیوین، ئەوەیە قەناعەتمان بەم خزمەتە قودسییەی "پەیامەکـانی نـوور" نەکـرد کە خـاوێنترین جیهـادی مەعنەویـیە و، لە ڕێـژنەی میراتگریـی نەبەویـیەوە "ویـلایەتی کـوبرا"ی بەدەسـت هێنـاوە و، خـولگەی نهێنیـی ئەو مەشرەبەیە کە هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەر بوون.

لە ئەنجامی ئاگادارکردنەوەی بەردەوام و توندوتیژمەوە بۆ برایان، توانرا ڕێی حەزکردنیان لە تەریقەتە سۆفییەکان لـێ بگیرێـت، کە لەم ڕۆژگـارەدا سـوودی کەمیـان بـۆ ئـێمە تێـدایە و، دەگونجێـت زیـان بەم بـارودۆخەی ئێسـتامان بگەیەنێت. دەنا ئەو حەز و ئارەزووە، یەکێتیی ئێمەی تێکدەدا و بیرەکانی ئێمەی پەرتەوازە دەکرد، کە ئەم کارەش نرخـی پشـتگیری و هاوپەیوەنـدیی برایـانی لە هەزار و سەد و یـازدەوە - کە لە یەکگرتنـی چـوار دانە "یەك"ەوە پەیـدا بـوون -

دادەبەزاندە نرخی تەنها چوار دانە و، دەبوو بە مـایەی لە یەك دووركەوتـنەوەی دڵەکـان. کە ئەوەش بەرامـبەر بەم ڕووداوە قورسـە، هێـزی ئـێمەی تەفروتوونـا دەکرد و هیچ ئاسەوارێکی نەدەهێشتەوە.

شێخ سەعدیی شیرازی[1] خاوەنی کتێبی "گولستان" دەگێڕێتەوە کە:

لە گۆشـەی خانەقایەکـدا پیـاوێکی خـاوەن تەقـوام لە ئەهـلی دڵ بینـی کە سەرقاڵی سەیروسلووك بـوو، کەچـی دوای چەنـد ڕۆژێـك لە قوتابخـانە و لە نێوان قوتابییانی زانستە شەرعییەکاندا بینیمەوە!

لێم پرسی: بۆچی وازت لەو خانەقایە هێنا کە سەرتاپا نوور و ڕوونـاکییە و، هاتوویت بۆ ئەم قوتابخـانەیە؟ وتی: ئەم خـاوەن نەجـابەت و هیممەتـبەرزانە، هاودەم لەگەڵ ڕزگارکردنی خۆیاندا بۆ ڕزگارکردنی کەسانی تریش تێدەکۆشن، بەڵام ئەوانەی ئەوێ تەنهـــا بـــۆ ڕزگـــارکردنی خۆیـــان هەوڵ دەدەن، ئەگەر سەرکەوتن لەم کارەیاندا بەدەست بهێنن! کەواتە نەجـابەت و هیممەتـبەرزی و چاکە لای ئەمانە، بۆیە هاتم بۆ ئێرە!

بەم جۆرە شێخی سەعدی پـوختەی ئەم ڕووداوەی لە کتێبـی "گولسـتان"دا تۆمار کردووە[2].

---

(١) شێخ موصلیحەددین سەعدیی شیرازی: شاعیرێکی خاوەن تەعبیری نیانە. لە شاری "شیراز" لە دایـك بـووە و، لە لە قوتابخـانەی"نیزامیە"ی بەغـدا خوێنـدوویەتی. سی سـاڵ تەمەنی لە گەشتوگوزار و هۆنینەوەی شیعردا بەسەر بردووە. هەر لە شیراز لە ساڵی (٦٩١ك) یـان (٦٩٤ك) ماڵئاوایی لەم دنیایە کردووە. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی "گولستان" و "بۆستان"ن. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی دانەر باسی کرد، واتای ئەم بەیتانەی شێخی سەعدییە:

صـاحبدلی بمدرسـه آمد زخـانقـاه — بشکست عهد صحبت اهل طریق را

گفتم میـان عالم و عابد چه فرق بود — تـا اختیار کَـردی از آن این فـریق را

گفـت آن گلیم خود بدر میبرد زموج — وین جهـد میکند کـه بگیرد غـریق را

بڕوانە: کلیات سعدی - گلستان، تهران - ١٣٦٩ ش. به اهتمام محمد علی فروغی (وەرگێڕ)

جا ئەگەر مەسەلە سادە و ئاساییەکانی نەحو و صەرف کە قوتابییان پێیانەوە خەریکـن وەك: "نَصَرَ، نَصَرَا، نَصَرُوْا" لەو ویردانە لە پێشـتر بن کـە لە تەکـیە و خانەقاکاندا دەخوێنرێن، دەبێ پلەوپایەی "پەیامەکانی نوور" چۆن بێـت کە ئەو حەقیقەتە ئیمانیـیە خاوینـانەی "آمنـتُ باللّـهِ وملائكتِـه وكُتُبِـه ورُسُـلِه وبـاليومِ الآخِرِ"یان لەخۆ گرتووە؟!

لە کاتێکدا کە "پەیامەکانی نوور" بە ڕوونترین شێوە و بەوپەڕی بێگومـانی و جەختەوە، ئەو حەقیقەتانە تەنانەت بۆ سەرسەختترین زەندیق و کەلـلەڕەقـترین فەیلەسـووفی ملـنەدەر دەچەسـپێنن و، بە بەڵـگە دەیانبەسـتنەوە و ڕێنماییـان دەکەن..

لە کاتێکدا کە ئەمە حاڵی پەیامەکانە، دەبێ ئەو کەسە چەندە لە هەڵەدا بێـت کە واز لەم ڕێگایە دەهێنێت، یان پەکی دەخات، یان قەناعەتی پێ ناکات و، بێ ڕوخسـەت و مۆڵەت خواسـتن لە پەیامەکـان و، بـۆ مەبەسـتی شـوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووی خۆی، دەچێتە ناو تەکیە و خانەقا داخراوەکانەوە!

لە هەمان کاتـدا ئەم کـارە ڕادەی شایسـتەییشـمان بـۆ ئەم زلـلەی تەمـێ و میهرەبانییە دەردەخات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# بێداركردنەوەیەك

## دوو بەسەرهاتی بچووك

**بەسەرهاتی یەكەم:**

پازدە ساڵ پێش ئێستا[1] كە لە باكووری ڕووسیا دیل بووم، لە نـاو هـۆڵێكی گەورەی كارگەیەكدا و لەگەڵ نەوەد كەس لە ئەفسەرەكانمان دەژیام..

لە ئەنجامی بێزاری و تەنگیی جێگاكەماندا، هەندێ جار گفتوگۆی نێوانیان پەرەی دەسەند و، دەنگیان بەرز دەبووەوە.

منیش لەبەر ئەوەی هەموویان ڕێزیان لێ دەگرتم هەمیشە هێورم دەكردنەوە.

پاشان پێنج دانەم لەو ئەفسەرانە دەستنیشان كرد بۆ سەقامگیركرنی ئارامی و هێمنی و، پێم وتن: لە هەر شوێنێكدا غەڵبە و دەنگەدەنگتـان بەر گـوێ كەوت یەكســەر بە پەلە بــگەنە ئەوێ و پشــتگیریی لایەنە ناڕەواكەیـان بــكەن! هەر لە ڕاستیشدا بەم كارە غەڵبەغەڵب و قڕە و دەنگ لە هۆڵەكەدا نەدەما!

پاشان كە لێیان پرسیم: بۆچی پێت وتین: یارمەتیی ئەو لایەنەیـان بـدەن كە لەسەر ناحەقە؟!

وەڵامم دانەوە كە:

مرۆڤی نـاحەق بێـویژدانە، لە بەرامـبەر چـل درەمـی حەوانەوەی كەسـانی ترەوە، واز لە درەمێك حەوانەوەی خۆی ناهێنێـت! بەڵام ئەو كەسـەی لە سـەر حەقە هەمیشە ویـژدانی تێـدایە و ئامـادەیە حەوانەوەی خـۆی، كە بە ئەنـدازەی درەمێكە، لە پێناوی جەوانەوەی هاوڕێكەیـدا بەخـت بكـات كە هێنـدەی چـل

---

(١) واتە ساڵی ١٩١٦ز. (وەرگێڕ)

درەم دەبێت. خۆ بەم وازهێنانەشی لە حەوانەوەی خۆی، قرە و غەڵبەغەڵب نامێنێت و هێور دەبێتەوە و، ئارامی باڵی ڕادەکێشێت و، هەر نەوەد ئەفسەرەکانی ناو ئەم هۆڵە بۆ خۆیان دەحەوێنەوە. بەڵام ئەگەر یارمەتیی ئەو کەسە خاوەن حەقە بدرێت، ئەوا قرە و غەڵبە پتر زیاد دەکات. بۆیە دەبێ لەم چەشنە ژیانە کۆمەڵایەتییانەدا "بەرژەوەندیی گشتی" ڕەچاو بکرێت.

دەسا برایانم! کەستان لەویتر بێزار نەبێت و نەڵێت: ئەم برایەم ویژدانی لەگەڵدا بەکارنەهێنام و مافی پێشێل کردووم. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە لەم ژیانە و لەم کۆبوونەوەیەی ئێرەماندا. خۆ ئەگەر هاوەڵەکەت بایی درەمێك زیانی پێ گەیاندوویت، تۆ بە بێزاربوون و وازهێنانت لێی بایی چل درەم زەرەر دەگەیەنێت. بەڵکو لەوانەیە بایی چل لیرە زیان بە "پەیامەکانی نوور" بگەیەنیت.

بەڵام سوپاس بۆ خوا، بەرگرییە ڕاست و دروست و بەهێزەکانمان کارێکیان کرد کە برادەرانمان بۆ لێکۆڵینەوە و پرسیار و وەڵامی تر بانگ نەکەن و، سەرلەنوێ ئیفادەی دووپاتبوویان لێ وەرنەگرنەوە. کە ئەمەش بوو بە مایەی ئەوەی شتی خراپ سەرهەڵنەدات و ڕیشەکەن بکرێت. دەنا بە وێنەی ئەوەی کە پووشێك بکەوێتە چاو یان پزیسکی ئاگر بکەوێتە ناو بارووتەوە، لەیەك بێزاربوونی نێوان برایانیش زیانی ئاوا گەورەیان پێ دەگەیاندین.

**بەسەرهاتی دووهەم:**

پیرەژنێك هەشت کوڕی هەبوو. جارێکیان سەروکولێرەی بە هەر یەکەیان دا، بێ ئەوەی هیچ بۆ خۆی بهێڵێتەوە. پاشان پێیی وتن: یەکی لەتێك کولێرە بەشی دایکتان بدەن! بەم جۆرە، خۆی چوار کولێرە و ئەوانیش یەکی لەتێکیان بەرکەوت!

برایانم! من لە خۆمدا هەست بە نیوەی ئازاری یەك بە یەکی ئێوە دەکەم، کە دەگەنە چل کەس! ئەوەش بزانن کە من گوێ بە ئازارە کەسی و تایبەتییەکانی

خۆم نادەم. بەڵام ڕۆژێکیان ناچار بووم کە بڵێم: "ئایا ئەمە تۆڵەی خۆمە وا سزا دەدرێم لەسەری"؟ ئنجا کەوتمە پشکنین بەناو ئەو حاڵەتانەی پێشوودا، بینیم کە من هیچ دەستێکم لە جووڵاندن و وروژاندنی ئەم موسیبەتەدا نەبووە، بەڵکو ئەوپەڕی دوورەپەرێزیم لێ کردووە.

بەو واتایەی کە ئەم موسیبەتە قەزایەکی خواوەندە بەسەرماندا باریوە و، ماوەی ساڵێکە لە لایەن خراپکارانەوە لە دژی ئێمە ساز کراوە و، لە توانامانـدا نەبووە خۆمانی لێ بپارێزین. بۆیە هەرچییەکمان بکردایە، نەماندەتوانی خۆمان بپارێزین لەوەی کە خستیانە ئەستۆمانەوە.

کەواتە سوپاس و پێزانین بۆ خوای گەورە کە توندوتیژیی موسیبەتەکەی لە "سەد"ەوە هێنایە خوارەوە بۆ سەر "یەك".

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە، ئێوە منەتم بەسەردا مەکەن و مەڵێن: ئێمە بەهۆی تۆوە بەم گیروگرفتە سزا دراین. نەخێر وا مەڵێن، بەڵکو لێم ببوورن و دوعای خێرم بۆ بکەن.

ئنجا ڕەخنەش لە یەکتر مەگرن و، بە یەکتری مەڵێن: گەر ئەو کارەت نەکردایە فڵانە شت ڕووی نەدەدا. چونکە بۆ نموونە: ئیعترافکردنی یەکێك لە برایانمان لەسەر خۆی لە بریی چەند کەسێك لەوانەی ئیمزایان لەسەر پەیامەکان کردبوو، زۆر کەسی ڕزگار کرد و، لە شان و شکۆی ئەو فڕوفێڵ و پیلانە زۆرانەشی هێنایە خوار کە ئەو کەسانەی ئەم کێشەیە گەورە دەکەن لە مێشکی خۆیاندا نەخشەیان بۆ کێشابوو. جا ئەم کارە هیچ زیانێکی تێدا نییە. بەڵکو سوودێکی گەورەی گشتیی تێدایە، چونکە بوو بەهۆی ڕزگارکردنی زۆر کەسی بێ تاوان.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# دوو سەرنج

ئەم بڕگانەی خوارەوە بریتین لە دوو سەرنج

**یەکەمیان:** تایبەتە بە خوو و ڕەوشتەکانەوە و، بەبۆنەی ئەو حاڵەتەوە نووسرا کە حەوانەوەی لێ زڕاندین و، لە ئەنجامی بێزاری و دەروونگرژی برایانەوە لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"سەری هەڵدا.

**دووهەمیان:** سەرنجێکی ناسکی ئایەتێکی پیرۆز و نیان و بەناوبانگە، بەڵام تا ئێستا ئەم سەرنجە پەنهان بووە.

**سەرنجی یەکەم:**

خوای گەورە، بە کەماڵی کەرەم و فراوانیی میهرەبانی و ڕەهایی دادگەریی خۆی، لەناو کردەوەی چاکدا پاداشتێکی داناوە و، لەناو کردەوە خراپەکانیشدا سزایەکی خێرا و زووی شاردووەتەوە. ئەوەتا لە ناوەندی کردەوە چاکەکاندا چەندین لەزەتی مەعنەویی داناوە کە نیعمەتی دواڕۆژ یادی مرۆڤ دەخەنەوە. لەناو کردەوە خراپەکانیشدا ئەوەندە ئێش و ئازاری مەعنەویی پێچاوەتەوە کە ئازاری سەختی ئەودنیای بیر دەهێننەوە.

بۆ نموونە: (خۆشەویستی و بڵاوکردنەوەی ئاسایش و سڵاو لەناو ئیمانداراندا) کردەوەیەکی چاکە بۆ ئیماندار. جا لە نێوان ئەم چاکەیەدا لەزەتێکی مەعنەوی و چێژێکی دەروونی و دڵکرانەوەیەکی وا هەیە کە پاداشتی ماددیی ئەودنیا بیری مرۆڤ دەخاتەوە. هەرکەسێك دڵی خۆی بپشکنێت هەست بەم چێژە دەکات.

هەروەهـا بـۆ نمـوونە: بڵاوکـردنەوەی ڕق و قـین و دوژمنـایەتی لە نێـوان ئیمانداراندا، کـردەوەیەکی خـراپ و چەپەڵە. جـا ئەم کـردەوە خـراپە، ئـێش و ئـازارێکی سـەختی دەروونیـی ئەوتـۆی تێـدایە کە "گیـان" و "دڵ"ی مـرۆڤ دووچاری تەنگەنەفەسی دەکـات. هەرکەسـێك خـاوەنی گیـانێکی هەسـتیار و هیممەتێکی بەرز بێت، هەست بەم ئێش و ئازارە دەکات.

مـن خـۆم بە درێژایـی ژیـانم زیـاتر لە سـەد تـاقیکردنەوەم لەم چەشـنە خراپکارییـانە بە خـۆمەوە دیـوە، چـونکە هەرکـات لە دەروونەوە دوژمنـایەتیم بەرامـبەر بـرایەکی ئیمانـداری خـۆم هەڵبگرتـایە، ئـازاری ئەو دوژمنـایەتییەم دەچەشت، بە چەشنێ کە هیچ گومانێکم نەدەمـا ئەو ئـازارە تـۆڵەیەکی خێـرا و زووی ئەو کردەوە خراپەی خۆمە و، لەسەر ئەوە سزا دەدرێم و ئازارم دەرخوارد دەدرێت.

نموونەیەکی تر: ڕێزگرتنی ئەوانەی شایانی ڕێزلێنـانن و، دەربڕینـی سـۆز و بەزەیـی بەرامـبەر بەوانەی شـایانی ئەم سـۆز و بەزەیـیەن، کـارێکی باشـە و بە کردەوەیەکی چاك بۆ ئیماندار دادەنرێـت. جـا لە ناوەنـدی ئەم کـردەوە باشـەدا لەزەتێکی گەورە و تامێکی خۆشی دەروونی هەیە کە لە ڕادەیەکی وادایە هەندێ جار وا لە خاوەنەکەی دەکات ژیانی خۆیشی لە پێناودا بەخت بکات.

ئەگەر دەتەوێت ئەمەت بە جوانی بۆ دەربکەوێت، فەرموو سـەیری دایکـان بکە چ لەزەتێك لەو شـەفەقەتە دەچێـژن کە بەرامـبەر منداڵەکانیـان دەریـدەبڕن، چونکە "دایك" لە پێناوی ئەم میهرەبانی و شەفەقەتەدا تا ئەو ئەنـدازەیە دەڕوات کە خۆیشـی بەخت بکـات. تەنـانەت ئەم ڕاسـتییە لە جیهـانی ئاژەڵانیشـدا بە ڕوونی دەبینیت، ئەوەتا مریشك لە پێناوی بەرگریکـردن لە بێچووەکـانی لەگەڵ شێریشدا دەجەنگێت. کەواتە ڕێـز و میهرەبـانی پاداشـتی زۆریـان تێـدایە. ئەو کەسانەی خاوەنی گیانی بەرز و دەروونی نەبەز و بەغیرەتن هەستی پێ دەکەن.

نموونەیەكی تر: هەڵپەكاری و ئیسراف تۆڵەیەكی مەعنەویی خێرا و سزایەكی زووی تێدایە بۆ مرۆڤ. چونكە ئەو كەسەی ئەم ڕەوشتەی تێدایە، لە ئەنجامی سكاڵای زۆر و دڵەتەپێ و نیگەرانیی خۆیەوە وەك مەستی لێ دێت و، تۆڵەی ئەو كردەوەیە و لەوەش زیاتر لە "حەسوودی" و "مونافەسە" و "غیرەت"ەوە بە خۆیەوە دەبینێت. بە ڕادەیەك كە "حەسوودی" پێش هەموو كەسێك مرۆڤی "حەسوودكار" دەسووتێنێت..

لە مەسەلەی "قەناعەت" و "تەوەككول"دا ئەمە پێچەوانە دەبێتەوە، چونكە ئەم دوانە پاداشتی گەلێ مەزنیان تێدایە، بە چەشنێ كە - ئەو پاداشتە - شوێنەواری موسیبەت و چڵك و چەپەڵیی فەقیری و موحتاجی دەشواتەوە.

نموونەیەكی تر: غروور و خۆبەگەورەزانین كۆڵێكی بێزلێكراوی قەبە و قورسە بەسەر شانی مرۆڤەوە. بە ڕادەیەك كە ئەو مرۆڤەی خاوەنی ئەم سیفەتەیە بەو ئازارەوە دەتلێتەوە كە دەبینێت ڕەزای لای خەڵكی قورس و گران بووە، لە كاتێكدا چاوەڕوانیی ڕێز و ئیحتیرامی لێ دەكردن! بەڵێ، ڕێز و گوێڕایەڵی داوا ناكرێن، بەڵكو دەبەخشرێن!

هەروەها "تەوازوع" و "وازهێنان لە غروور و تەكەببور" لەزەتێكی خێرا و پاداشتێكی كتوپڕیان تێدایە، كە مرۆڤی تەوازوعكار لە كۆڵی قورسی ڕیاكردن ڕزگار دەكات.

هەروەها وەك ئەوەی كە:

"بەدگومانی" و "خراپ لێكدانەوە"ی هەر شتێك، تۆڵەیەكی خێرا و زووی هەر لەم دنیایەدا تێدایە، بە ڕادەیەك كە وتەی: "مَنْ دَقَّ دُقَّ" بووە بە دەستوورێكی سەرەكی..

جا ئەو كەسەی گومانی بەدی بەرامبەر بە خەڵكی هەیە، بە حەتمی خۆیشی گرفتاری ئەوە دەبێت گومانی بەدی پێ ببرێت..

هەروەها ئەو کەسەی هەڵسوکەوتی برایانی ئیماندراری خۆی بە چەشنێکی خراپ لێکداوەتەوە، بێ چەندوچۆن خۆیشی لە نزیکترین کاتدا دووچاری هەمان تۆڵە دەبێتەوە!

هەموو ڕەوشت و ڕەفتارە باش و خراپەکان وەك ئەم نموونانەی پێشوو تەماشا بکە.

لە خوای گەورەی میهرەبان داواکارین ئەو هەموو تام و لەزەتە مەعنەوییە ناوبراوانە بەو کەسانە بچێژێت کە تامی ئەو چەشنە ئیعجازە مەعنەوییەی قورئان دەکەن کە لەم زەمانەدا لە "پەیامەکانی نوور"ەوە دەرکەوتووە، تا - پشت بەخوا - ڕەوشتە خراپەکان توخنی ئەوان نەکەون.

* * *

سەرنجی دووهەم:

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ ۞ مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ ۞ إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينِ﴾ (الذاريات:٥٦-٥٨).

واتای ڕواڵەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە، وەك لە زۆربەی تەفسیرەکاندا باس کراوە، هەرگیز ئەو شێوازە بەرزە دەرناخات کە لەگەڵ بەلاغەتی خاوەن ئیعجازی قورئاندا بگونجێت. بۆیە زۆربەی جار بیری منی بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکرد. وا ئێستا لە نێوان ئەو واتا جوان و بەرزانەی کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هاتنە دڵمەوە، بە کورتی سێ ڕوو باس دەکەین:

○ ڕووی یەکەم:

هەندێ جار خوای گەورە هەندێ حاڵەت دەداتە پاڵ خۆی کە دەکرێت هی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی بن ﷺ، بۆ مەبەستی ڕێزلێنانی. لێرەشدا بەهەمان جۆرە، چونکە ئەو واتایەی کە لەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەوەدا مەبەستە، دەبێ "ئیطعام" و "ڕۆزی پێدان"ێك بێت کە بگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ..

واتە: پێغەمبەرەکەم لە ئەنجامدانی ئەرکی پێغەمبەرایەتی و ڕاگەیاندنی فەرمانی بەندایەتیی خەڵکیدا بۆ خوای گەورە، هیچ کرێ و پاداشت و ئیتعامێکی لە ئێوە ناوێت..

دەنا گەر مەبەست ئەم واتایە نەبێت، ئەو کاتە دەبێت بە هەواڵدان لە شتێکی هێندە زانراو کە لەوپەڕی ئاشکرایی و ڕوونیدایە، کە ئەمەش لەگەڵ بەلاغەتی خاوەن ئیعجازی قورئاندا ناگونجێت!

○ ڕووی دووهەم:

مرۆڤ گەلێ شەیدای ڕۆزییە و، لەو گومانەدایە کە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ڕۆزی ڕێی پەرستش و بەندایەتیی لێ دەگرێت! جا بۆ لابردنی ئەم گومانە و، بۆ ئەوەی نەکرێت بە بیانوویەك بۆ وازهێنان لە "خواپەرستی" ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ و، ئامانجی بەدیهاتن تەنها لەوەدا دەستنیشان دەکات کە خەڵکی "خوا بپەرستن" و، هەوڵدانیشیان بۆ ڕۆزی لەو ڕووەوە کە ئەنجامدانی فەرمانی خوایە، ئەویش هەر بەندایەتییە بۆ خوای گەورە.

خۆ سەبارەت بە ئامادەکردنی ڕۆزیشەوە بۆ بەدیهاتووان و بۆ ئێوە و کەسوکار و تەنانەت ئاژەڵەکانیشتان، ئەوا من دەیگرمە ئەستۆی خۆم و، ئێوەم هەرگیز بۆ ئەو کارە دروست نەکردووە. چونکە هەرچی پەیوەندیی بە ڕۆزی و خۆراکبەخشینەوە ببێت تایبەتە بە منەوە و، هەر خۆم ڕەززاقی خاوەن هێزی

توندوتۆڵ و تەواوەتیم. کەواتە (هەوڵدان بۆ ڕۆزی) مەکەن بە بیانوو بۆ وازهێنان لە "پەرستش". چونکە خۆم ڕۆزیی هەموو ئەو بەندانەم دەنێرم کە پەیوەندیی پێتانەوە هەیە.

دەنا گەر مەبەست لەم ئایەتەدا ئەم واتایە نەبێت، ئەوا وەك هەواڵدانێك دەبێت لە شتێکی ئاسایی و زانراو! چونکە زۆر ئاشکرا و بەڵگەنەویستە کە مەحاڵە ڕزق و ڕۆزی بدرێت بە خواوەند. چونکە لە زانستی بەلاغەدا دەستوورێك هەیە کە ئەوە دەگەیەنێت:

ئەگەر واتای هەر گوفتارێك شتێکی ئاشکرا و بەدیهی بوو، ئەوا ئەو واتایە مەبەست نییە لەو گوفتارەدا، بەڵکو واتای مەبەست شتێکی ترە کە "لازم"ی ئەو واتا ڕواڵەتییەیە، یان یەکێکە لە شوێنکەوتەکانی ئەو واتا ڕواڵەتییە..

بۆ نموونە:

ئەگەر کەسێك هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بێت، پێی بڵێیت: "تۆ قورئانت لەبەرە"، ئەم گوفتارە هەواڵدانە لە شتێك کە لای خۆی ئاشکرا و زانراوە! کەواتە دەبێت مەبەست ئەوە بێت کە: من دەزانم تۆ قورئانت لەبەرە. واتە ئاگاداری دەکەمەوە لە شتێك کە نایزانێت، کە بریتیە لەوەی من دەزانم ئەو قورئانی لەبەرە!

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە، دەبێ مەبەست لە واتای ئەم ئایەتەی کە کینایەیە لە نەفیکردنی ڕۆزی پێدان و ئیتعامی خوای گەورە، ئەمەی خوارەوە بێت:

ئێوە بۆ ئەوە بەدی نەهێنراون کە ڕۆزی بەو بەدیهاتووانەم بگەیەنن کە خۆم ڕۆزییانم لە ئەستۆ گرتووە، چونکە خۆم ڕۆزییان دەدەم. بەڵکو واجبی بنەڕەتیی ئێوە بەندایەتییە بۆ خوای گەورە و، هەوڵدانە بەپێی فەرمانەکانی بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی، کە ئەویش لە خۆیدا جۆرێکە لە جۆرەکانی پەرستش.

○ ڕووی سێهەم:

واتای ڕواڵەتیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿لَمْ يَلِدْ ۝ وَلَمْ يُولَدْ﴾ی سوورەتی ئیخلاس، ئاشکرا و بەدیهییە.

کەواتە دەبێ ئەو واتایەی کە تیایدا مەبەستە یەکێك بێت لە لازمەکانی ئەو واتایە..

واتە: ئەو کەسانەی دایك و منداڵیان هەیە، هەرگیز ناگونجێت "خوا" بن.

کەواتە خوای گەورە بە فەرمایشتی ﴿لَمْ يَلِدْ ۝ وَلَمْ يُولَدْ﴾ کە ئاشکرا و بەدیهییە و، مەبەستی پێی ئەزەلییەت و ئەبەدییەتی خوای گەورەیە، دەیەوێت نەفیی خوایەتی لە حەزرەتی عیسا و عوزەیر - درووديان لەسەر بێت - و مەلائیکەت و ئەستێرە و پەرستراوە ناڕەوا و بەتاڵەکان بکات.

جا هەروەك ئەمە لەم ئایەتەدا وایە..

بە هەمان جۆر، واتای ئایەتی پیرۆزی: ﴿مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ﴾یش ئەوەیە کە:

هەرچی ڕۆزیی بوێت و خۆراکی دەرخوارد بدرێت و ڕۆزیپێدان و ئیتعامی لەباردا بێت، هەرگیز ناگونجێت بە "خوا" دابنرێت، چونکە ئەوەی پێویستی بە ڕۆزی و ئیتعام ببێت، شایانی "خوایەتی" نییە!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# سەبارەت بە "قەیلوولە"

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

﴿أَوْ هُمْ قَائِلُونَ﴾ (الأعراف:٤)

"ڕەئفەت" بایەخی بە واتای وشەی ﴿قَائِلُونَ﴾ی ئەم ئـایەتە پیـرۆزە داوە کە دەفەرموێت:

﴿أَوْ هُمْ قَائِلُونَ﴾.

وا بە بۆنەی پرسیارکردنی ڕەئـفەتەوە لەم وشـەیە ئەم باسـەم نـووسی، تـاکو قەڵەمە ئەڵماسـییەکەی لەکـار نەکەوێـت، بەهـۆی خـاوبوونەوەی لەشی لە ئەنجامی نوستنەوەی دوای نوێژی بەیانی، بە وێـنەی ئەوانەی کە لە بەنـدیخانە لەگەڵیدان!

نوستن سێ جۆرە:

**یەکەم: "غەیلوولە"**

کە بریتییە لە نوستنی دوای نوێژی بەیانی تا کۆتایی هاتنی کـاتی کەراهەت. ئەم نوسـتنە پـێچەوانەی سـوننەتی خـاوێنە. لەبەر ئەوەی، وەك لە فەرمـوودەی پیـرۆزدا هـاتووە، دەبێـت بە مـایەی نوقسـانیی ڕۆزی و نەمـانی بەرەکەتەکەی. چونکە باشترین کاتی ئامادەکردنی پێشـەکییەکانی هەوڵـدان بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕۆزی کەش و هەوای ناسکی دوای نوێژی بەیانییە..

بەڵام پاش بەسەرچوونی ئەو ماوەیە، مرۆڤ دووچاری سستی و خاوبوونەوەی لەش دەبێت، کە ئەمەش زیان بە کۆششی ئەو ڕۆژەی و ئنجا بە ڕۆزییەکەشی دەگەیەنێت. هەروەك دەشبێت بە هۆی نەمانی بەرەکەتی ڕۆزی. کە ئەمەش بە چەندین تاقیکردنەوەی زۆر چەسپاوە.

**دووهەم: "فەیلوولە"**

کە بریتییە لە نوستنی دوای نوێژی عەسر تاکو شێوان. ئەم نوستنە دەبێت بەهۆی کەمبوونەوەی تەمەن. واتە تەمەنی مرۆڤ لە ڕووی ماددییەوە لەو ڕۆژەدا کەم دەبێتەوە کە خەوی غەفڵەتبەخشی تێکەڵ کرابێت، چونکە ئەو ڕۆژە کەم و کورت دەردەکەوێت. هەروەك بەسەربردنی کاتی عەسریش بە نوستن، لە حوکمی نەبینینی ئەنجامە مەعنەوییەکانی ئەو ڕۆژەدایە، کە زۆربەی جار لەو کاتەدا ئەو ئەنجامانە خۆیان پێش‌چاو دەخەن. وەك بڵێی مرۆڤ ئەو ڕۆژە نەژیابێت!

**سێهەم: "قەیلوولە"**

کە سوننەتێکی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و، کاتەکەشی لە چێشتەنگاوە تا نەختێکی کەمی دوای نوێژی نیوەڕۆ بەردەوام دەبێت. جا هەروەك ئەم نوستنە بە سوننەت دادەنرێت[1] لەهەمان کاتیشدا یارمەتیی مرۆڤ دەدات بۆ شەونوێژ کردن.

---

(١) عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "قيلوا فإن الشياطين لا تقيل". حديث حسن أخرجه أبو نعيم في الطب ١/١٢، وأخرجه الطبراني في الأوسط ٢٧٢٥، وقال الحافظ في الفتح ٧٠/١١ وفي سنده كثير بن مروان وهو متروك ورمز السيوطي لحسنه، وهو كما قال (انظر فيض القدير ٥٣١/٤ والمقاصد الحسنة ٥٦ وكشف الخفاء ٣٣٠ وصحيح الجامع الصغير برقم ٤٣٠٧. وعن أنس رضي الله عنه قال: كنا نُبَكِّرُ بالجمعة ونقيل بعد الجمعة، أخرجه البخاري برقم ٩٠٥، ٩٤٠، وعن سهل بن ساعد قال: ما كنا نقيل ولانتغذى إلاّ بعد الجمعة، أخرجه البخاري ٩٣٩. قال الحافظ في الفتح ٧٠/١١: أخرج سفيان بن عيينة في جامعه من حديث خوان بن جبير رضي الله عنه موقوفاً قال: نوم

ئەو شتەش کە ئەم سوننەتە نەبەوییەی جێگیر کـردووە، عـادەتێکی خەڵـکی دوورگەی عەرەبە کە بەپێی ژیـنگەی خۆیـان و لە دەمـی زیـادبوونی گەرمـای نیوەڕۆدا، تا ڕادەیەك کارەکانیان ڕادەگرن و پشووی تێدا دەدەن.

ئەم نوسـتنە، تەمەنی مرۆڤ درێژ و ڕۆزیشـــی زیـاد دەکـات. چـونکە نیـو سـەعاتی خەوی قەیلـوولە بەرامـبەر دوو سـەعاتی خەوی شـەو دەبێـت. واتە سـەعات و نیوێـك لە تەمەنی ئەو ڕۆژەی مـرۆڤ زیـاد دەکـات و لە هەمـان کاتیشـدا سەعات و نیوێك لە چنگـی نوسـتن ڕزگـاری دەکـات کە هــاوتای مردنە و، بە زیادکردنی کاتی کارەکانی و دەستخستنی ڕۆزیـش ژیـان بە بەر ئەو کاتانەیدا دەکات و، بەمەش درێژە بە کاتی کار و کۆششی دەدات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

---

أول النهار حرق وأوسطه خلق وآخره حمق. وانظر الفتح ٤٢٨/٢ إنهم كانوا يؤخرون القائلة حتى تكونَ بعد صلاة الجمعة إذ العادةُ في القائلة أنْ تكونَ قبلَ الزوال. (وەرگێـڕ، لە چـاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە)

# ئەمەش خاتیرەیەکی جوانە

کاتێك کە لە دوای نوێژدا ڕستەی "ألفُ ألفِ صلاةٍ وألفُ ألفِ سلامٍ علیـك یـا رسـولَ اللّـە"م دەخوێنـد، لە دوورەوە خـاتیرەیەکی ناسـکم دی کە لەو سڵاواتانەوە دەرکەوتن. کەچی نەمتوانی بە تەواوەتی بیگـرم و دەسـتی خـۆمی بخەم. بەڵام وا ئێستا ئاماژە بۆ هەندێ ڕستەی ئەو خاتیرەیە دەکەم:

"جیهـانی شـەو"م وەك مەنـزڵێکی نـوێ بینـی کە بـۆ ئەم خـانەیەی دنیـا دەکرایەوە. منیش لە دوای نوێژی خەوتنان ڕۆشتمە ناو ئەو جیهانەوە.

جـا لە ئەنجـامی کـرانەوەی لە عـادەتبەدەری ئەندێشـەم و، بە حـوکمی پەیوەندیی ماهییەتی مرۆڤانەشم لەگەڵ سەرتاسەری دنیـادا، ئەو شـەوە دنیـای مەزنم لە بەرچاودا بوو بە مەنزڵێکی هێندە بچووك کە وەخـت بـوو ئـادەمیزاد و زیندەوەرانی ناوی بە چاو نەبینرێن. ئنجا لە ئەندێشەی خۆمدا دەمبینی کە هیچ کەسێك نییە ئەو خانە و مەنزڵە ڕووناك بکـاتەوە جـگە لە کەسـێتیی مەعنەویـی پێغەمبەر ﷺ کە هەموو گۆشـەیەکی ئەو مەنـزڵەی لە شـادمانی و هـاودەمی و خۆشحاڵی پڕ کردبوو. جا هەروەك مرۆڤ کە دەچێتە مەنزڵێکەوە پـێش هەمـوو شتێك سڵاو دەکات، منیش شەوقێکی مەزن و ئارەزوویەکی بەجۆشـم لە دڵـی خۆمدا هەست پێدەکرد کە بڵێم:

" ألفُ ألفِ صلاةٍ وألفُ ألفِ سلامٍ علیك یا رسولَ اللّە"[1].

---

(١) چـونکە ئەو میهرەبـانییەی کە بـۆ سـەر پێغەمـبەری ئـازیز ﷺ نـازڵ بـووە، ڕووی لە پێداویسـتییەکانی سەرانسـەری نەتەوەکەیەتی لە زەمەنـێکی ئەبەدیـدا، بـۆیە ئەو سـڵاواتە نەبڕاوەیەی کە پێشکەشی دەکرێت، گەلێ شیاو و گونجاوە.

ئەگەر کەسێك بڕواتە ناو خـانوویەکی خـاڵی و تاریـك و سـامناك - وەك ئەم دنیـا تاریـك و سامناك و پڕ لە بێئاگاییە - دەبێ چەندە گرفتاری سام و مەترسی و دڵەتەپێ ببێـت، بەڵام گەر

لێرەدا خۆمم وا بینییەوە كە وەك بڵێی بە ئەندازەی ژمارەی جیننی و ئادەمیزاد سڵاوی لێ بكەم و، بەم سڵاوەشم بەیعەتی لەگەڵدا نوێ بكەمەوە و، ڕەزامەندی و قبوولكردنی پێغەمبەرایەتییەكەی دەرببڕم و، گوێڕایەڵیی ئەو یاسایانەی بكەم كە لەگەڵ خۆیدا هێناونی و، ملكەچی فەرمانەكانی ببم و، هیوای دووری و سەلامەتی بۆ بخوازم لە گشت بەڵا و گیروگرفتەكانی ئێمە.

واتە وام هەست دەكرد كە وەك بڵێی زمانی ئەم سڵاوەم بەو واتایانە خستبووە گوفتار و، بە ناوی یەك بە یەكی هەموو ئەوانەوە پێشكەشم دەكرد كە لە جیهانی مندان و بریتین لە خاوەن هەست و شعوورەكانی جیننی و ئادەمیزاد و، ئنجا سەرجەمی بەدیهاتووان!

هەروەها ئەو نوورە مەزن و دیارییە بەنرخەی كە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی، هەروەك جیهانی تایبەتیی هەموو كەسێكی ناو ئەم دنیایە ڕووناك دەكاتەوە، بە هەمان جۆر جیهانی تایبەتیی منیش ڕووناك دەكاتەوە و، ئەم جیهانە بۆ هەموومان دەكات بە جیهانێكی پڕ لە نیعمەت..

بۆیە لە بەرامبەر ئەو نیعمەتە مەزنەوە وتم: "اللّهُمَّ أَنْزِلْ أَلْفَ صَلاةٍ عَلَيه". بەو هیوایەی كە ببێت بە شوكرانە و پێزانینێك بۆ ئەو نوورە خۆشەویست و دیارییە بەنرخە. چونكە ئێمە هەرگیز ناتوانین پاداشتی ئەو بدەینەوە، بۆیە بە دوعا و پاڕانەوە لە دەرگانەی خواوەنددا لاڵانەوەی خۆمان ڕادەگەیەنین، تاكو

---

ببینێت كەسێك لە سەرووی ئەو خانووەوە دانیشتووە و شتومەكی ناو مەنزڵی پێ دەناسێنێت، چەندە دڵخۆش و شادمان دەبێت و دڵی ڕووناك دەبێتەوە؟ ئەی ئایا دەبێت چی بڵێیت گەر ئەو كەسە پێغەمبەری مەزن بێت ﷺ كە خۆشەویست و خۆشویستراوی خواوەندە و، دڵنەوایی بەخشی مرۆڤە و، لە لای سەرووی خانە و لانەی جیهاندا دانیشتووە و، لە ڕێی شتانی ناو ئەو خانووەوە خاوەنە بەخشندەكەیمان پێ دەناسێنێت؟!

بۆ خۆت ئەمە لێك بدەرەوە، تاكو نرخ و بەها و لەزەتی سڵاوات لەسەردانی بزانیت چەندەیە! (دانەر)

له گەنجینەی میهرەبانیی خۆیەوە و بە ژمارەی دانیشتووانی سەرجەمی ئاسمانەکان، ڕەحمەت و میهرەبانیی خۆی بەسەردا ببارێنێت..

بەڵێ، به ئەندێشەی خۆم وا هەستم دەکرد.. چونکه پێغەمبەر ﷺ لەو ڕووەوە کە "بەندە"یە و له خەڵکەوە ڕووی له حەق تەعالایە، داوای سڵاوات دەکات له ئێمە، کە واتای "میهرەبانی" دەگەیەنێت.. لەو ڕووەشەوە کە "پێغەمبەر"ە و له حەق تەعالاوە ڕووی له خەڵکە، شایانی "سڵاو" لێکردنە.

ئنجا هەروەك ئێمە بە ئەندازەی ژمارەی جیننی و ئادەمیزاد سڵاو بۆ مەقامی بەرزی ئەو دەنێرین و، هەر بەو ژمارەیەش بەیعەتی گشتیی لەگەڵدا نوێ دەکەینەوە، پێغەمبەریش ﷺ بە ئەندازەی دانیشتووانی ئاسمانەکان و بە ناوی هەموو یەکێکیانەوە شایانی سڵاواتێکە کە لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندەوە بۆی ڕەوانە بکرێت. چونکه ئەو نوورەی کە ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لەگەڵ خۆیدا هێنای کەماڵ و نرخی هەموو شتێکی ناو ئەم بوونەوەرە دەردەخات و، لە ڕێی ئەم نوورەوە ئەو ئەرکە دەبینرێت کە پەروەردگار خستوویەتیە ئەستۆی یەك بە یەکی بەدیهاتووانی و، هەر لەو ڕێیەشەوە ئامانجە خواییەکان لە دروستکردنی هەموو بەدیهاتوویەك دەردەکەون. لەبەر ئەوە، ئەگەر هەموو شتێك خاوەنی زمان بووایە، ئەوا هەروەك بە زمانی حاڵ دەیڵێت، بە زمانی گوفتاریش دەیوت: "الصَّلاةُ والسَّلامُ علَيكَ يا رسولَ اللّه".

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە لە بریی سەرجەمی بوونەوەران دەڵێین:

" ألفُ ألفِ صلاةٍ وألفُ ألفِ سلامٍ عليك يا رَسُوْلَ اللّهِ، بعَدَدِ الْجِنِّ و بِعَدَدِ الْمَلَكِ والنُّجُوم."

فيكفيك أنَّ اللّهَ صلّى بنفسِه وأملاكُه صلَّتْ علَيه وسَلَّمَتْ

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# سەبارەت بە "وحدة الوجود"

برای ئازیزم!

داوای هەندێ ڕوونکردنەوەتان لە بارەی "وحدة الوجود"ەوە کردبوو، لە کاتێکدا کە یەکێك لە بریسکەکانی مەکتووبی سی و یەکەم[1] وەڵامێکی تێروتەسەل و بەهێز و ڕوونی تێدایە سەبارەت بە ڕای محیێدینی کوڕی عەرەبی لەم مەسەلەیەدا.

بەڵام لێرەدا هەر هێندە دەڵێین کە:

بەگوێدادان و وتنەوەی مەسەلەی "وحدة الوجود" بە خەڵکی، لەم کاتەی ئێستادا، گەلێ زیانیان پێدەگەیەنێت..

چونکە هەروەك ئەگەر تەشبیهات و نموونەهێنانەوە لە دەستی خەواصەوە دەربچن و بڕۆنە دەستی عەوامەوە، یاخود لە دەستی زانستەوە بکەونە ناو دەستی جەهل و نەزانی، ئەوا وەکو حەقیقەت وەردەگیرێن[2]..

"وحدة الوجود" و ڕاستییە بەرزەکانی هاوچەشنیشی بە هەمان جۆرن، چونکە ئەگەر بکەونە نێوان کەسانی عەوامی بێئاگا و ئەوانەی باوەڕیان بە "کاریگەریی هۆکارەکان" هەیە، ئەوا ئەم مەسەلەیە لە شێوەی "سروشت"دا وەردەگرن و، سێ زیانی گرنگی لێ دەبێتەوە بۆیان:

---

(١) واتە "بریسکەی نۆهەم" لە کتێبی "بریسکەکان". (وەرگێڕ)

(٢) بە وێنەی ئەو دوو مەلائیکەتە مەزنەی کە ناویان "ثَوْر" و "حُوت"ە و، بەهۆی نهێنیی تەشبیهەوە لای عەوام شێوەی گایەکی مەزن و نەهەنگێکی زەبەلاحیان وەرگرتووە! (دانەر)

❖ زیانی یەكەم:

هەرچەند مەشرەبی "وحدة الوجود" لە حوكمی ئینكاریكردنی وجوودی بوونەوەراندایە لە ئاستی وجوودی خوای گەورەدا، بەڵام هەتا بڕواتە نێوان چینی عەوامەوە، ئەوا بەرە بەرە لەو مەبەستە دوور دەكەوێتەوە تا لە بیروبۆچوونی بێئاگایانی ئەو چینەدا، بە تایبەت ئەوانەیان كە بیریان بە ماددییات چەپەڵ بووە، هێندە لە مەبەست دەترازێت كە دەیانگەیەنێتە ئینكاریی خوایەتیی خوای گەورە لە ئاستی گەردوون و شتانی ماددیدا!

❖ زیانی دووهەم:

مەشرەبی "وحدة الوجود" زۆر بە توندی دەست بە ڕووی پەروەردگارێتیی هەرشتێكی تری غەیری خوای گەورەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە، تەنانەت ئینكاریی غەیری خوا دەكات و باوەڕ بە بوونی شتێكی تری جگە لە خوا ناكات و بوونی سەربەخۆ نە بۆ دەروونی بەدخواز و نە بۆ هیچ شتێك دانانێت.

بەڵام لەم ڕۆژگارەدا كە چەمكەكانی "سروشت" بەسەر بیروبۆچوونەكانی خەڵكدا زاڵ بوون و، دەروونە بەدخوازەكانیش وەك فیرعەونیان لێ هاتووە، بە تایبەت ئەوانەی كە ئامادەیی ئەوەیان تێدایە "نەفسی خۆیان" لە بریی خوای گەورە بپەرستن، نەخوازەڵا لە سەردەم و كاتێكدا كە لەخۆباییبوون و خۆپەرستی فووی تێ كراوە و، تا ڕادەیەكیش خەڵكی بەدیهێنەر و دواڕۆژیان لە بیر چووەتەوە.. بێگومان باسكردنی "وحدة الوجود" ئا لەم سەردەمەدا و بۆ ئەو جۆرەكەسانە - پەنا بە خوا - دەروونی بەدخوازی ئەوانە لە ڕێ دەترازێنێت. تەنانەت ئەوانە لەم ڕێیەوە هێندە لە خۆیان بایی دەبن كە ئیتر دەروونیان جێی هیچ شتێكی تری تێدا نابێتەوە!

❖ زیانی سێهەم:

ئەم مەشرەبە هەندێ بیروبۆچوونی ئەوتۆ لە مرۆڤدا بەجێدەهێڵێت كە شایانی "پێویستیی بوون"ی زاتی شكۆمەندی خواوەند نییە، كە زاتێكە دوورە لە

نـاتەواوی و نەنگـی و ئـاڵوگۆڕ و لەتبـوون و جێگـرتن و، ئەو شـتانەی کە هەرگیزاو هەرگیز لەگەڵ ئەو خاوێنییەی زاتی خوای گەورەدا ناگونجێت. بـۆیە ئەم مەشرەبە - بەم بۆنەیەوە - دەبێت بەهۆی چەند تەڵقینێکی بەتاڵ و ناڕەوا.

بەڵێ، ئەو کەسەی لە بارەی"وحدة الوجود"ەوە دەدوێـت، دەبـێ بە هـزر و بیـری خـۆی لە زەویـیەوە بەرەو ئاسـمانەکان بەرز ببێـتەوە و، سـەرجەمی بوونەوەران لە پشتسـەری خـۆیەوە بەجێبهێڵێـت و، ڕوانینـی تەنهـا ئاراسـتەی عەرشی بڵنـد بکـات و، لە حـاڵەتی نـوقم بوون(ئیسـتیغراق)دا بـوونەوەران بە "نەبوو" دابنێت..

ئەو کاتە بە "هێزی ئیمان" دەتوانێت ببینێت کە هەموو شتێك ڕاسـتەوخۆ لە خواوەندی تاك و تەنیاوەیە.

دەنا ئەو کەسـەی لە پشـتی ئەم بـوونەوەرانەوە ڕاوەسـتاوە و لەوێـوە بۆیـان دەڕوانێت و، هۆکارەکان لە بەردەمـی خۆیـدا دەبینێـت و، لە زەویـیەوە تەماشـا دەکـات. لەوانەیە لە "کـاریگەریی هۆکارەکـان"دا نـوقم ببێـت و بکەوێـتە نـاو زەلکاوی "سروشت"ەوە.

بەڵام ئەو کەسەی کە وەك جەلالەددینی ڕۆمی[1] بە فیکر و بیـر بـۆ عەرشی مەزن سەردەکەوێت، دەتوانێ بڵێت:

(١) مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی لە شـاری (بەلەخ) لە دایـك بـووە و لە شـاری (قـۆنیە)ش کۆچی دوایی کردووە. لە نێـوان سـاڵەکانی: (٦٠٤-٦٧٢ك/ ١٢٠٧-١٢٧٣ز)دا ژیـاوە. لە فیقهی حەنەفی و سـەرجەمی زانسـتەکانی ڕۆژگاری خۆیدا زانایەکی بەناوبانـگ و بەتوانـا بووە و، دوای وەفاتی باوکی لە سـاڵی (٦٢٨ك)دا لە چـوار قوتابخـانەی شـاری "قـۆنیە"دا دەرسی وتووەتەوە. پاشان ڕێبازی تەسەووفی گرتووەتەبەر و (شەمسی تەبرێزی) لەم بوارەدا ڕابەریی کردووە. پاشان تەریقەتی "مەولەوی"ی دامەزراندووە. گەلێ بەرهەمی دوای خـۆی بەجێهێشتووە، وەك (فیه ما فیه، دیوان شمس تبریـزی، دیـوان کبیـر) بەڵام بەناوبانگترینیـان (مەسنەویی مەعنەوی)یە کە بیست و شـەش هەزار بەیتـی شـیعرە بە زمـانی فـارسی و، بـۆ

"گوێ ڕابگرە و دەرگای بیستنت بکەرەوە، چونکە ئەو شتەی کە لە حەق تەعالا دەیبیستیت، دەشتوانیت لە هەموو کەسێکی ببیستیت"..

دەنا ئەو کەسەی کە نەتوانێت وەك ئەو بۆ ئەم پلە بڵندە بەرز ببێتەوە و، سەرجەم بوونەوەران لە عەرشەوە تا فەرش بە وێنەی چەند ئاوێنەیەك نەبینێت بۆ تیادرەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەند، گەر پێی بڵێیت: "گوێ لە هەموو شتێك ڕابگرە، چونکە گوفتاری خوای لێ دەبیستیت" ئەوا گرفتاری چەندەها بۆچوونی بەتاڵ و ناڕەوا و دژی حەقیقەت دەبێت، وەك ئەوەی لە ناوەڕۆك و مەعنادا لە عەرشەوە بەرەو فەرش کەوتبێتە خوارەوە!

﴿قُلِ اللهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ في خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ (الأنعام:٩١).

ما لِلتُّراب وَلِرَبِّ الأرباب؟!

سُبْحَانَ مَنْ تَقَدَّسَ عَنْ الأشْبَاهِ ذاتُه، وتَنزَّهَتْ عَنْ مُشَابَهَةِ الأمْثَالِ صِفَاتُه، وشَهِدَ علىَ رُبُوْبِيَّتِه آياتُه، جَلَّ جَلالُه ولا إلهَ إلاّ هُو.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

---

چەندین زمانی جیهانی وەرگێڕراوە و بووە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی مەولانا لە سەرتاسەری جیهاندا. بۆ زانینی درێژەی ژیانی بڕوانە: (مولانا جلال الدين الرومي في حياته وشعره، تأليف: الدكتور محمد عبدالسلام الكفافي، دار النهضة العربية، بيروت،١٩٧١) هەروەها بەرگی یەکەمی: (رجال الفكر والدعوة فى الإسلام) نووسینی خوالێخۆشبوو (السيد أبو الحسن الندوي). (وەرگێڕ)

# وەڵامی پرسیارێك

ئەوەنــدە كــاتی پێویســتم بە دەســتەوە نیــیە كە بەراوردێــك لە نێــوان بیــروبۆچوونەكــانی هەریەك لە "مســتەفا صــەبری"[1] و "مووســا بــاكۆف"[2]دا بكەم. بەڵام هێندە دەڵێم كە:

یەكێكیان زیاد لە پێویست ڕۆچــووە و، ئەوی تریشــیان هەنــدێ حەقــیقەتی پشــتگوێ خســتووە. چــونكە هەرچەنــدە "مســتەفا صــەبری" لەچــاو "مووســا بــاكۆف"دا لە بەرگرییەكانیــدا لەســەر حەقە، بەڵام مــافی شــكاندنی كەسی محێدینی كوڕی عەرەبیــی نیــیە، كە یەكــێكە لە كەسێتییە دەراســاكانی زانســتە ئیسلامییەكان.

بەڵێ، محێدینی كوڕی عەرەبی بۆ خۆی وەرگیراوە و لەسەر ڕێی هیــدایەتە، بەڵام لە هەموو نووسراوەكانیدا ڕابەر و ڕێنیشاندەر و پێشەنگ نییە بۆ خەڵــكی، چونكە زۆربەی جار بە بێ ڕەچــاوكردنی میــزانی ڕاســتییەكانی شــەرع هەنگــاو دەنێــت و، بە پــێچەوانەی قاعیــدە و دەســتوورەكانی ئەهــلی ســوننەت ڕەفتــار

---

(١) مستەفا صەبری (١٨٦٩-١٩٥٤ز) شێخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی بووە و، بەرەنگاری بزوتنەوەی كەمالیست بووەتەوە. دواتر كۆچی كردووە بــۆ میســـر. گرنگترینــی بەرهەمەكــانی بریتییە لە "موقف العقل و العلم والعالِم من رب العالمين و عباده المرسلين". (وەرگێڕ)

(٢) مووسا جارولڵا بــاكۆف" توركســتانی و قــازانییە و، شێخولئیســلامی دەوڵەتی ڕووســیای قەیســەری بــووە. مــاوەیەك بە مەبەســتی ڕزگــاربوون لە ڕژێمــی قەیســەری پشــتی شــۆڕشی بەلشەفیكی گرت، بەڵام دوایی ڕاستیی ئەو شۆڕشەی بۆ دەركەوت و، چەندین جار بەند كــرا. بە زۆر وڵاتدا گەڕاوە و، نزیكەی سەد و بیســت كتێبــی لە بــابەتە جۆراوجۆرەكــانی ئیســلامدا داناوە. ڕا و بۆچوونەكانی ڕووكــاری نوێخوازیــان لەخــۆ گرتــووە. گــرنگترین بەرهەمەكــانی بریتییە لە "الوشيعة في نقض عقائد الشيعة". لە قاهیرە كۆچی دوایی كردووە. (وەرگێڕ)

دەکـات و، هەنـدێ لە گوفتـارەکانیشـــی بە ڕواڵەت گـومڕایی دەگەیەنێـت، هەرچەندەش خۆی لە گومڕایی بەرییە. چونکە هەندێ جار گوفتار لە ڕواڵەتدا بە "کوفر" دەردەکەوێت بەڵام خاوەنەکەی بە "کافر" دانانرێت..

جا "مستەفا صـەبری" ئەم خـاڵانەی ڕەچـاو نەکـردووە، بـۆیە لە پشـتگیری کردنیدا بۆ قاعیدە و دەستوورەکانی "ئەهلی سوننەت" هەنـدێ شـتی پشـتگوێ خستووە و دووچاری "تەفریط" بووە.

بەڵام "مووسا باکۆف" بە بۆنەی ئەو بیروبۆچوونـانەی خـۆیەوە کە شـان بە شانی شارستانێتییە و زۆر بە تونـدی لایەنی نوێخـوازی دەگرێـت، ئەوا گەلـێ جـار بە هەڵەدا دەچێـت، چـونکە هەنـدێ لە ڕاسـتییەکانی ئیسـلام بە چەنـد تەئـــویلێکی هەڵە دەســـتکاری دەکـــات و، کەســـێکی وەرنەگیـــراوی وەك "ئەبولعەلای مەعەڕڕی" دەخاتە ئاسـتێکی بەرزتـر لە هـی زانایـانی لێکـۆڵەری ئیسلام و، زیاد لە پێویست لە لایەنگرتنی توندوتیژیدا بۆ ئەو مەسەلانە ڕۆچووە کە محیّدینی عەرەبی تیایانـدا پـێچەوانەی ئەهـلی سـوننەتی کـردووە و، لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی ئەمدا یەکیان گرتووە.

شێخ محیّدین خۆی وتوویەتی:

"تحرُمُ مطالعةُ كتُبنا علَى مَن ليس مِنّا".

واتە: خوێندنەوەی کتێبەکانمـان حەرامە لەو کەسـانەی شـارەزای مەقـامی ئێمە نین.

بەڵێ، خوێندنەوەی کتێبەکانی شێخ محیّدین، بە تایبەت ئەو مەسەلانەی کە لە "وحدة الوجود" دەدوێن، لەم سەردەمەدا زیانی هەیە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# تێڕامانێك لە پەنجەرەی بەندیخانەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

کاتێ لە پەنجەرەی بەندیخانەوە و لە چاویلکەی "بیرکـردنەوەم لە دواڕۆژ و نیگەرانیم بۆ ئاییندە" سەیری پێکەنینە گریانهێنەکانی مرۆڤم دەکرد لە ڤیسـتیڤاڵی ڕەنگینـی شـەودا، یەکسـەر لە بەردەم بینینـی ئەندێشـەمدا ئەم بـارودۆخەی خوارەوەم لێ دەرکەوت:

وەك ئەوەی لەسەر شاشـەی سـینەمادا بارودۆخەکـانی ژیـانی ئەو کەسـانە دەبینرێت کە ئێستا لەناو گۆڕەکانیاندا ڕاکشاون..

بە هەمان شێوە منیش تەرمـی بـزۆك و جـووڵاوی ئەو خـاوەن گـۆڕانەم لە پـێش چـاوی خۆمـدا بینـی کە لە ئاینـدەیەکی نزیکـدا دەمـرن و دەڕۆنە نـاو گۆڕەکانیان! بۆیە ئازار و هەستی بێزاری سەریان تێکردم و، بـۆ حـاڵی ئەوانەی کە ئێستا لە پێکەنیندان، دامە پڕمەی گریان!

پاشان سەردانی ژیریی خۆمم کرد و لە "حەقیقەت"م پرسی: ئەم ئەندێشـەیە چییە؟!

"حەقیقەت" وەڵامی دامەوە کە:

پێـنج کەس لەو پەنجـا کەسـە بەدبەختـانەی کە ئێسـتا وا پێـدەکەنن و لە خۆشی و شادمانیدان، دوای پەنجـا سـاڵی تـر دەبینیـت پیـر و پەکـکەوتەن و، پشتیان چەمیوەتەوە و، تەمەنیشیان خۆی لە حەفتا ساڵ داوە!

چل و پێنج دانەکەی تریشیان لەنـاو گۆڕەکانیانـدا لەشـیان شی دەبێـتەوە و دەبنەوە بە گڵ!

کەواتە ئەو ڕوخسارە جوان و پێکەنینە شادمانانە، دوایـی هەڵـدەگەڕێنەوە و پێچەوانە دەبنەوە! خۆ بەپێی دەستووری "كُلُّ آتٍ قريب"[١] بینینی ئەو شـتانەی کە لەمەولا دێـن، وەك ئەوەی ئێسـتا هـاتبن و ڕوویانـدابێت، کـارێکی حەقە و ڕاستیی لەخۆ گرتووە. کەواتە ئەو شتانەی بینیتن، هەموویان ڕاستین و هیچیـان ئەندێشە نین.

جا مادەم ئەو پێکەنینە غەفڵەت ئامێزانەی دنیا، تێکڕا کاتی و لەناوچوون و، ئەم چەشنە حاڵەتە ئازاربەخش و گریانهێنەرانەیان لە خـۆدا شـاردووەتەوە، ئەوا دەبێ تەنها یەك شت هەبێت "دڵ"ی مرۆڤی بەدبەختـی عاشـقی "هەمیشـەیی" خـۆش بکـات و، شـادمانی بە "گیـان"ی شـەیدا و تـامەزرۆی "مـانەوە" و "نەمری"ی ئەو ببەخشێت، کە ئەویش بریتییە لە گەمە و گاڵتەوگەپی خـاوێن و چەنـد دڵخـۆشی و شـادمانییەك کە لە چوارچێـوەی شـەرعدان و بەهـۆی پاداشتەکەشیانەوە "مانەوە" بەدەست دەهێنن، هاودەم لەگەڵ شوکرانەبژێرییەکدا کە بە دڵنیایی و دڵبێداری و دوور لە بێئاگایی ئەنجام بدرێت.

جا بۆ ئەوەی ڕۆژانی جەژن "بێئاگایی" لەناو دەروونەکاندا پەرە نەسێنێت و پاشان مرۆڤ لە بازنەی شەرع دەرنەکات، فەرموودە پیرۆزەکان گەلـێ هانـدانی زۆر و بەهێزیـان تێـدایە لەسـەر شـوکرانە و یـادی خـوای گەورە لەو ڕۆژانەدا. چونکە بەم کارە نیعمەتەکانی "خۆشی" و "شادمانی" دەبن بە شوکرانەبژێرییەکی ئەوتۆ کە نیعمەت زیاد و بەردەوام بکات، لەبەر ئەوەی "شوکر" نـیعمەت زیـاد دەکات و، بێئاگاییش نایهێڵێت و لایدەبات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

---

(١) رواه ابن مردويه عن ابن مسعود مرفوعاً وموقوفاً، ورواه البيهقي في الأسماء والصـفات عـن أبي شـهاب مرسـلاً. (كشـف الخفـاء ١١٤/٢). (وەرگێـڕ، لە چـاپی عەرەبیـی "اللمعات"ەوە)

# دەروونی بەدخواز

بسم الله الرحمن الرحيم

یەکێك لە سەرنجەکانی ئایەتی پیرۆزی:

﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ (يوسف:٥٣).

هەروەها فەرموودەی پیرۆزی: "أَعْدَى عَدُوِّكَ نَفْسُكَ الَّتي بَيْنَ جَنْبَيْكَ"(١).

بەڵێ، ئەو کەسەی کە دەروونی بەدخوازی پاکژنەکراوی خۆی خۆش بوێت و لێی ڕازی بێت، لە ڕاستیدا هیچ کەسێکی تری خۆش ناوێت. تەنانەت ئەگەر خۆشەویستی بەرامبەر کەسێکی تر دەرببڕێت، ئەوا لە ناخی دڵیەوە خۆشی ناوێت و، لەوانەیە تەنها لەبەر بەرژەوەندییەکانی و ئەو سوودەی لێیەوە چاوەڕێی دەکات، ئەو خۆشەویستییەی لە ڕوودا بنوێنێت!

ئەو مرۆڤەی کە ئەمە حاڵیەتی، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە خۆی لای خەڵکی خۆشەویست بکات و ڕەزامەندییانی دەستگیر ببێت و، لەم پێناوەشدا هیچ قسوور و ناتەواوییەك بۆ خۆی دانانێت، بەڵکو بە چەشنی

---

(١) "أعدى أعدائك نفسك التي بين جنبيك"، رواه البيهقي في الزهد بإسناد ضعيف وله شاهد من حديث أنس. والمشهور على الألسنة: أعدى عدوك..إهـ (كشف الخفاء ١٤٣/١) قال العراقي في تخريج الإحياء (كتاب عجائب القلب): أخرجه البيهقي في كتاب الزهد من حديث ابن عباس، وفيه محمد بن عبد الرحمن بن غزوان أحد الوضاعين. إهـ وقال الزبيدي في شرح الإحياء ٢٠٦/٧ تعقيباً على العراقي: ووجدتُ بخط ابن حجر ما نصّه: وللحديث طرق أخرى غير هذه من حديث أنس. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە)

پارێزەر(محامي)ێکی دڵسۆز بۆ مەبەستی "تەبریەبوون" بەرگری لە خۆی دەکات و، بە چەندەها موبالەغە بەڵکو درۆ و دەلەسەش بە شان و باڵی خۆیدا دەخوێنێت، تاکو لە هەموو نەنگی و ناتەواوییەك پاکی بکاتەوە، تا دەیگەیەنێتە ڕادەی تەقدیسکردن..

بەڵکو بەوەشەوە ڕاناوەستێ و لەوەش زیاتر پێی لێ ڕادەکێشێت، تا دەیگەیەنێتە ئەوەی ناوەرۆکی ئەم ئایەتەی تێدا بێتەدی کە دەفەرموێ:

﴿مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ﴾ (الفرقان:٤٣)..

ئیتر ئەو کاتە زللەی یەك لە دوای یەکی ئەم ئایەتە دەچێژێت و، بەرامبەر بەو مەدح و ستایشەی کە بۆ خۆی ڕەوای دەبینی، خەڵکی پشتی لێ هەڵدەکەن و.. بەرامبەر بەوەش کە خۆی لای خەڵك خۆشەویست دەکرد، ڕەزای لایان قورس دەبێت و، لە ئەنجامدا پێچەوانەی مەبەستەکانی خۆی دێنە ڕێی!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بە بۆنەی ڕیاکاریی لەو کردەوانەدا کە بۆ دواڕۆژ دەکرێن، ئیخلاسیش لەدەست دەدات و، لە بەردەم هەست و هەوا و ئارەزووەکانیدا، کە پاشەڕۆژ نابینن و بیر لە ئەنجامەکان ناکەنەوە و تەنها حەزیان لە تام و لەزەتی کاتیی ئێستایە، ئەم لە بەرامبەریانەوە دەستەپاچە دەمێنێت. تەنانەت هەوا و ئارەزووە سەر لێ شێوێنەکانی، بۆ جۆرەها کاری وا هانی دەدەن کە لەبەر لەزەت وەرگرتنی لە چێژێکی کەمی یەك سەعاتی، ساڵێکی تەواو، بەڵکو لەوانەیە دە ساڵی ڕەبەقیش لە بەندیخانەکاندا تەمەن بباتە سەر و، بەو جۆرە سزای دادگەرانەی خۆی بچێژێت..

هەموو ئەمانەشی لە پێناوی دامرکاندنی گیانی تۆڵەسەندنەوە و، ئارەزووی لەخۆباییبوون - کە خولەکێکیش ناخایەنێت - دێنەڕێ.

ئەو مرۆڤە لەمەدا وەك ئەو منداڵە نەفامە وایە کە نرخی ئەو جزمەی قورئان نازانێت کە دەرسی تێدا دەخوێنێت و، دەچێ بە پارچە شیرینییەکی دەگۆڕێتەوە. ئەمیش کردەوە چاکەکانی، کە لە ئەڵماس بەنرخترن، بە چەند شتێکی بێنرخی

وەك شووشە وردەیان دەگۆڕێتەوە، کە بریتین لە: هەست و هەوا و ئارەزوو و لەخۆباییبوون..

دیارە بەم کارەشی زیانێکی گەلێ مەزن دەکات، لە شتێکدا کە دەبوو قازانجی زۆر و باشی لێ بکردایە!

اللّهُمَّ احْفَظْنَا مِنْ شَرِّ النَّفْسِ وَالشَّيْطَانِ وَمِنْ شَرِّ الْجِنِّ وَالإِنْس.

* * *

# پرسیارێك

**پرسیار:**

چۆن "مانەوەی هەمیشەیی" لە بەندیخانەی دۆزەخدا، بە سزایەکی دادگەرانە دادەنرێت، بۆ "تاوانی کوفر"ێك کە لە زەمانێکی کورتدا کراوە؟

**وەڵام:**

تاوانی "کوشتن" کە لە یەك خولەکدا ئەنجام دەدرێت، بە حەوت ملیۆن و هەشتسەد و هەشتا و چوار هەزار خولەك "بەندکردن" سزای بۆ دادەنرێت، لەو ڕووەوە کە ساڵ لە سێسەد و شەست و پێنج ڕۆژ پێکدێت. جا ئەگەر ئەم سزایە بەلای مرۆڤەوە یاسایەکی دادگەرانە بێت، ئەوا بەپێی ئەم یاسا دادگەرانەیەی مرۆڤ کەسێك بیست ساڵی تەمەنی بە کافری بباتەسەر و بە کافریش بمرێت، شایستەی بەندکردنێکە کە پەنجا و حەوت ترلیۆن و دووسەد و یەك ملیار و دووسەد ملیۆن ساڵ بخایەنێت! لەو ڕووەوە کە خولەکێکی ماوەی کافربوون بەرامبەر هەزار تاوانی "کوشتن" دادەنرێت. دەشتوانرێت لەمەوە ڕووی پێکەوەگونجانی ئەم تاوانە لەگەڵ دادگەریی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەدا بزانرێت کە دەفەرموێ: ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً﴾ (البينة:٨).

نهێنیی پەیوەندیی نێوان ئەم دوو ژمارە تەواو لە یەکتر دوورە لەوەدایە کە:
هەریەك لە تـاوانی "کـوفر" و "کوشـتن" ڕووخانـدن و کاولکـاری و دەستدرێژیکردنن بۆ سەر خەڵکی و کاریگەریشـیان کەسـانی تـر دەگـرێتەوە، چونکە تاوانی "کوشتن" کە لە یەك خولەکدا ئەنجـام دەدرێـت، بەپێـی ڕواڵەتی حاڵ بەلای کەمەوە پازدە ساڵی ژیانی کوژراوەکە لەناو دەبـات، بـۆیە لە بریـی ئەو مـاوەیە بابـای قاتـڵ بەنـد دەکرێـت. ئنجـا تەنهـا یەك خـولەکی تـاوانی "کوفر"یش کە بریتییە لە ئینکاریی هەزار و یەك ناوی جوانی خـوای گەورە.و.. ناشیرینکردنی نەخشونیگارە ناوازەکانی ئەو ناوانە و.. دەستدرێژی بۆسەر مافی بـوونەوەران و.. ئینکـاری کـردنی کەماڵاتیـان و.. بەدرۆخسـتنەوەی بەڵـگە لەژمارەبەدەرەکانی وەحدانییەت و.. وەرنەگرتنی شایەتیدانی ئەو بەڵگانە..
یەك خولەکی تاوانی "کوفر" کە ئەمە ناوەرۆکەکەیەتی، مرۆڤی کافر بۆ زیاتر لە هەزار سـاڵ دەهـاوێتە بـنکی "أَسْـفَلَ سـافِلين"ەوە و، لە فەرمایشـتی: ﴿خَالِدِينَ﴾ی خوای گەورەدا بەندی دەکات!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# یەککەوتنێکی ناسکی پڕ لە واتا

مـاددەی ژمـارە (١٦٣)ی قـانوون، کە قـوتابییانی نـووری پـێ تاوانبـار دەکرێت و، لە ڕێیەوە داوای سزادانیان پێش‌چاوی دادگا دەخرێت، ئەم ژمـارەیە لەگەڵ ژمارەی ئەو ئەندامانەی پەڕلەماندا یەك دەگرێتەوە کە ڕەزامەندییان نوانـد لەسەر لائیحەیەکی پەرلەمان کە تایبەت بوو بە بەخشینی سەدوپەنجا هەزار لیرە

بۆ بنیاتنانی قوتابخانەی دانەری "پەیامەكـانی نـوور" كە ژمارەیـان ١٦٣ نـوێنەر بوو لە نێوان دووسەد نوێنەری ئەنجومەنی نەتەوەیی توركیادا!

جـا ئەم تەوافـوقە لە واتـادا دەڵێـت: ئیمزاكـردنی سـەد و شەسـت و سـێ نوێنەری حكوومەتی كۆماری، لە ڕووی ڕێزلێنان و سەرسووڕمانەوە بەرامبەر بە خزمەتگوزارییەكـانی دانەری ئەو پەیامـانە، بێگومـان حـوكمی مـاددەی ژمـارە (١٦٣) سەبارەت بەو دانەرە بەتاڵ دەكاتەوە!

هەروەها یەكێكی تر لەو تەوافوقە ناسك و خاوەن واتایانە ئەوەیە كە:

گرتنـــــی دانەری "پەیامەكـــــانی نـــــوور" و قوتابییـــــانی لە بەرواری ٢٧/نیسانی/١٩٣٥دا بوو، كەچی بڕیـاری دادگـا سـەبارەت بەوان لە بەرواری ١٩/ئابی/١٩٣٥دا بوو. واتە دوای سەد و پازدە ڕۆژ. خۆ ئەم ژمارەیەش لەگەڵ ژمارەی كتێبەكانی پەیامی نووردا یەك دەگرێتەوە كە سەدوپازدە كتێبن و سـەد و بیسـت و هەشـت پەیامیـان لەخـۆ گرتـووە. هەروەك لەگەڵ ژمـارەی ئەو سەدوپازدە قوتابییـانەی نووریشـدا یەك دەگـرێتەوە كە تۆمەتبـار كـراون و، بـۆ مەبەستی لێپرسینەوە و لێكۆڵینەوە گیران و بەندكران.

جـــا ئەم تەوافـــوقە بەڵـــگەیە لەســـەر ئەوەی كە ئەو موســـیبەتەی دانەری پەیامەكانی نوور و قوتابییانی دووچاری بوون، تەنهـا بە دەسـتێكی چـاودێریی خوایی ڕێكدەخرێن[1].

* * *

(١) جێی سەرنجە كە یەكەم جـار هەنـدێك لە قوتابییـانی نـوور دەسـتگیر كـران لە بەرواری ٢٥/نیسانی/١٩٣٥دا بوو، ژمارەی ئەوانەش كە بە بڕیاری دادگا تاوانبار كـران (١١٧) كەس بوو، چونكە ناوی دوو كەسیان دووپـات بووبـووەوە! بەمەش ژمـارەی ئەو (١١٧) قوتـابییە لەگەڵ ژمارەی ڕۆژەكانی گرتنیاندا یەك دەگرێتەوە كە (١١٧) ڕۆژ بوو، لە بەرواری گرتنی ئەو چەند قوتابییەوە تا ڕۆژی بڕیاری دادگا!

ئەم تەوافوقەش نەرم و نیانییەكی تر ئاوێتەی تەوافوقەكانی پێشوو دەكات. (دانەر)

سەرنجی بیست و هەشتەمی
بریسکەی بیست و هەشتەم

# ڕوونکردنەوەی سێ مەسەلە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿لا يَسَّمَّعُونَ إِلى الْمَلإِ الأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ ۞ دُحُوراً وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ۞ إِلاَّ مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ (الصافات:٨-١٠)

﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ﴾ (الملك:٥)

وا بەبۆنەی ئیعترازێکەوە کە لە لایەن گومڕایانەوە و لە شێوەی ڕەخنەدا ئاراستە دەکرێت، سەرنجێکی گرنگی نێوان سەرنجەکانی ئەم ئایەتانە و ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان ڕوون دەکەینەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەوە دەگەیەنن کە:

جاسووسەکانی جیننی و شەیتانەکان، بە دزییەوە گوێ لە هەواڵی ئاسمانەکان دەگرن و، لەوێوە هەواڵی غەیبی بۆ کاهین و ماددییەکان و ئەوانە دەهێننەوە کە لە "تحضیر الأرواح"دا کار دەکەن. بەڵام لە کاتی سەرەتای نازڵبوونی وەحیدا و بۆ ئەوەی هیچ شتێك وەحی نەئاڵۆزێنێت و کاری تێنەکات، ڕێ لەم هەواڵهێنان و جاسووسییە بەردەوامەی ئەو جاسووسانە گیرا و، لە جاران زیاتر بە تیرەستێرەکان(الشهاب) تیرەباران کران.

وا لەم بارەیەوە - زۆر بە پوختی - وەڵامی پرسیارێکی یەکجار گرنگی سێ لقی دەدەینەوە.

**پرسیار:**

مرۆڤ وا لەم ئایەتانەی سەرەوە دەگات كە:

بـۆ مەبەسـتی سووسـەكردن و وەرگرتنـی هەواڵـی غەیبـی، تەنـانەت لە ڕووداوی جوزئیشدا، بگرە لە ڕووداوە كەسییەكانیشدا، جاسووسی شـەیتانەكان خۆیـان دەگەیەنـنە مەمـلەكەتی ئاسـمانەكان، كە تـابلێی دوورن و، هەمـوو شـەیتانێك دەتوانێـت لە هەر جێگـایەكەوە بیەوێـت بچێـتە نـاو ئاسـمانەكان و ئەگەرچـی بە شـێوەیەكی پچـڕ پچـڕیش بێـت گـوێ لەو هەواڵە بگرێـت و بیهێنێتەوە بۆ زەوی.. جا ئەم واتـایەی كە لەم ئـایەتە پیـرۆزانەوە وەردەگیرێـت، ژیری و دانایی قبووڵی ناكەن و وەری ناگرن..

پاشان هەندێك لە پێغەمبەران كە خاوەنی پەیامن و ئەولیاكـانیش كە دارای كەرامەتن، بە دەقی ئـایەت، بەروبوومەكـانی ئەو بەهەشـتەیان كە لە سـەرووی ئاسمانە بەرزەكانەوەیە بە چەشنێك دێتە دەست وەك بڵێی لە شوێنێكی نزیكەوە وەریبگرن و، هەندێ جاریش لە نزیكەوە بەهەشت دەبینن..

خـۆ ئەم مەسـەلەیەش ئەوپەڕی دووری لەوپەڕی نزیكیـدا دەگەیەنێـت، بە چەشنێك كە لە ژیریی ئەم سەردەمەدا جێی شتی وا نابێتەوە..

پاشان باسكردنی حاڵەت و ڕووداوێـكی جـوزئیی كەسـێكی جـوزئی لای "هاودەمـانی بڵنـد"ی ئاسـمانە بەرز و یەكجـار فراوانەكـان، لەگەڵ كـاری بەڕێوەبردنی ئەم گەردوونەدا ناگونجێت كە بەوپەڕی دانایی بەڕێوە دەبرێت..

ئاشكراشە كە ئەم سێ مەسەلەیە لە حەقیقەتە ئیسلامییەكان دەژمێررێن؟!

**وەڵام:**

**یەكەم:**

ئایەتی پیـرۆزی: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ﴾ ئەوە دەگەیەنێـت كە جاسـووسی شـەیتانەكان بـۆ مەبەسـتی

سووســــەکردن، هەوڵـــی ســــەرکەوتن بەرەو ئاســــمانەکان دەدەن. بەڵام بە ئەستێرەکانی ئاسمان لەوێ دەردەکرێن.

لە وتەی پازدەهەمدا زۆر بە ڕێکوپێکی لەم مەسەلەیە دواوم و، بە چەشـنێك چەسـپاندوومە کە قەنـاعەت بە سەرسـەختترین کەسی مـاددیش ببەخشـێت، بەڵکو پێی ڕازی بێت و ناچاری بکات بێدەنگ ببێت. ئەویـش لە ڕێـی حەوت پێشـەکیی گومـانبڕی ئەوتـۆوە کە وەك حەوت پـلە وان بـۆ سـەرکەوتن بەرەو تێگەیشتن لەم ئایەتە پیرۆزە.

**دووهەم:**

بە نموونەیەك ئاماژە بۆ ئەم سێ حەقیقەتە ئیسـلامییە دەکەیـن کە وا گومـان دەبرێت لە ژیرییەوە دوور بن. تاکو لەم ڕێیەوە لە زەینە کـورت و تەسـکەکانەوە نزیکیان بخەینەوە:

وا دابنـێ فەرمـانگەی "سـەربازی"ی حکوومەتێـك کەوتبێـتە خـۆرهەڵاتی وڵات و، فەرمـانگەی "دادگەری"شی لە خۆرئـاوا و، فەرمـانگەی "پەروەردە و زانستەکان"یش لە باکوور و، فەرمانگەی "کاروباری ئایینیی"ش(مەشیەخەت) لە باشوور و، فەرمانگەی "کارمەندە ئیداری"یەکانیش لە ناوەڕاستی وڵاتدا بێت... هتد.

جـا هەرچەنـدە ئەم فەرمانگـانەی حکـوومەت ئـاوا لە یەکتریـیەوە دوورن، کەچی گەر لە ڕێی تەلەفۆن و تەلگرافەوە پەیوەندیی تەواوەتی بە یەکەوە بکەن، ئەوا سەرانسەی وڵات وەکو تەنهـا یەك فەرمـانگەی لـێ دێـت کە فەرمـانگەی دادگەری، یان سەربازی، یان ئایینی، یان ئیدارییە... هتد.

نموونەیەکی تر: هەندێ جار ڕێ دەکەوێـت کە چەنـد وڵاتـێکی جیاجیـای خــاوەن پــایتەختی جیــاواز، پــێکەوە و بە چەنــد دەســتەڵاتێکی جیاجیــا لە مەملەکەتێکدا بەشداری دەکەن، لە ڕووی بەرژەوەندییە ئیستیعمارییەکانیان لەو

وڵاتەدا، یـان لەبەر ئیمتیـازی تایبەتییـان لەوێـدا، یـاخود لە ڕووی مـامەڵەی بازرگانی و شتی تریشەوە..

جا هەمـوو یەكێـك لەو حكوومەتـانە لە ڕووی ئیمتیازەكـانی خـۆیەوە لەو وڵاتەدا پەیوەنـدییەكی تـایبەتیی بە هاوڵاتییـانی ئەو دەوڵەتەوە دەبێـت. خـۆ هەرچەندە ئەو هاوڵاتییانە یەك ڕەعیەت و یەك نەتەوەن، كەچی مامەڵەكانی ئەو حكـوومەتە جیاجیـا و یەكجـار دوورانە لە یەك بە یەكی هەمـوو مـاڵێكی ئەو وڵاتەدا كارێـك دەكـات لە یەكـتری نزیكیـان بخـاتەوە و بەر یەكـتر بـكەون. تەنـانەت لە هەمـوو مرۆڤێكیشـدا بەشـداری دەكەن، بە ڕادەیەك كە مەسـەلە جوزئییەكانی ئەو وڵاتانە لە بـازنە جوزئییەكانیانـدا دەبیـنرێن كە خاڵەكـانی بەر یەككەوتـن و لێـك نزیكبوونەوەیـانە لەوێـدا، بـێ ئەوەی هەمـوو یەكێـك لەو مەسەلە جوزئییانەش لە بازنە كوللییەكە وەربگیرێت. بەڵام كاتێ كە لەو مەسەلە جوزئییـانە دەكـۆڵنەوە بە جۆرێـك لێیـان دەدوێـن كە وەك بڵێـی لە فەرمـانگە كـوللییەكە وەرگیـرابن، لەبەر پەیوەنـدیی ئەو بـابەتە جوزئییـانە بە یاسـا هەمەكییەكانی ئەو بـازنە كـوللییەوە و، شێوەیەكیشـیان دەدرێتـێ كە دەڵێـی ئەو مەسەلەیە لە بازنەی كوللییەكەدا خراوەتە بەر باس و لێكۆڵینەوە!

بەم جۆرە و لەبەر ڕووناكیی ئەم دوو نموونەیەدا دەڵێین:

مەممـلەكەتی ئاسـمانەكان، كە لە ڕووی مەڵبەنـد و پـایەتەختەوە تـابڵێی لە یەكترییەوە دوورن، دارای چەندین تەلەفۆنی مەعنەوین كە بەرەو دڵـی خەڵـكی لە مەملەكەتی زەویدا ڕاكێشراون. ئەمە جگە لەوەی كە جیهـانی ئاسـمانەكان بە تەنهـا سەرپەرشـتیكردنی جیهـانی مادديیـان لە ئەسـتۆ نەنـراوە، بەڵكـو لەگەڵ ئەوەشدا سەرپەرشتیی "جیهـانی ئەرواح" و "جیهـانی مەلەكـووت"یش دەكەن، بۆیە جیهانی ئاسمانەكان لە ڕوویەكەوە و لە ژێر پەردەوە دەوراندەوری جیهانی بینراو(شهادة)ی داوە..

هەروەها بەهەشتیش كە یەكێكە لە جیهانە باقییەكان و خانەی مانەوە، هەرچەندە تابڵێی دوورە، كەچی بە چەشنێكی نوورانی بازنەی تەسەرڕوفاتی فراوان بووە و لە ژێر پەردەی جیهانی بینراودا بەرەو هەموو لایەك بڵاو بووەتەوە.

ئنجا هەرچەندە مەڵبەندەكانی ئەو هەستانەش جیاجیایە كە كردگاری شكۆمەند و دانا بە دانست و توانستی خۆی لە "سەر"ی مرۆڤدا دایناون، كەچی هەریەكەیان بەسەر هەموو جەستەدا زاڵە و سەرانسەری جەستە لە ناوەندی بازنەی تەسەرڕوفیدایە.

جا گەردوونیش، كە مرۆڤێكی یەكجار گەورەیە و هەزاران جیهانی وەك بازنە هاوچەق و لەناو یەكەكانی لەخۆ گرتووە، بە هەمان جۆرە..

ئەوەتا ئەو بارودۆخ و ڕووداوانەی كە لەو جیهانانەدا ڕوو دەدەن، لە ڕووی جوزئییات و كوللیات و تایبەتكارییەكان و گەورەیی ئەو ڕووداوانەوە، هەموو دەبینرێن و لە بەرچاودان.

بەو واتایەی كە حاڵەت و ڕووداوە جوزئییەكان لە شوێنە نزیك و جوزئییەكانەوە دەبینرێن، كەچی ڕووداوە كوللییەكان و كاروبارە مەزنەكان لە مەقامە كوللی و گەورەكانەوە دەبینرێن.

بەڵام هەندێ جار ڕووداوێكی جوزئیی تایبەت، بەسەر جیهانێكی مەزندا زاڵ دەبێت و، ئیتر لە هەر شوێنێكەوە گوێ ڕابگیرێت ئەو ڕووداوە دەبیسترێت..

هەندێ جاری تر چەندەها سەربازی زۆر و زەبەندە كۆ دەكرێنەوە، بۆ مەبەستی دەرخستنی سام و شكۆ و مەزنیی دەستەڵات، نەك لەبەر هێزی دوژمن. بۆ نموونە:

لەبەر ئەوەی ڕووداوی پێغەمبەرێتی حەزرەتی محەممەد ﷺ و نازڵبوونی وەحیی قورئانی، ڕووداوێكی گەورە و شكۆمەندە، ئەوا سەرانسەری جیهانی

ئاسمانەکان، بەڵکو تەنانەت هەموو سووچ و گۆشەیەکیشی بۆ ئەم مەبەستە ئامادەیە و، لە بورجە گەورەکانی ئەو ئاسمانە بەرز و تەواو دوورانەدا پاسەوانەکان ڕیز ڕیز ڕاوەستاون و لە ئەستێرەکانەوە مەنجەنیق دەهاوێژن، تاکو جاسووسی شەیتانەکانی لێ دەربکەن و لە ئاسمانەکان دووریان بخەنەوە.

جا کە ئایەتە پیرۆزەکە ئەم مەسەلەیە بەم چەشنە ئاشکرا دەکات و ڕەجمی زۆر و زەبەندەی شەیاتین و تیربارانیان بە تیرەستێرەکان دەردەخات، بە تایبەتی ئەو کاتە و لە سەرەتای نازڵ بوونی "وەحی"دا، ئەم کارە ئاماژەیەکی پەروەردگاریی ئاشکرا دەکات کە پلەی گەورەیی وەحیی قورئان و بریسکانەوەی دەستەڵاتی دەردەخات و، پلەی تەواو حەقبوون و ڕاستی و دروستیی قورئان ڕادەگەیەنێت، کە لە ڕادەیەکدایە نە لە بەردەمی و نە لە پشتەوەی و نە لە هیچ لایەکیەوە نارەوایی توخنی ناکەوێت.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز ئەم ڕاگەیاندنە گەردوونییە مەزنە دەردەبڕێت و، پەنجەش بۆ ئەو ئاماژەکردنە ئاسمانییە ڕادەکێشێت.

بەڵێ، ئاشکراکردنی ئەم ئاماژە ئاسمانییە گەورانە و دەرخستنی زۆرانبازیی شەیتانەکان لەگەڵ مەلائیکەتاندا، لە کاتێکدا کە دەتوانرێت تەنها بە فوویەکی یەك مەلائیکەت جاسووسەکانی شەیاتین دەربکرێن، ئەم کارە تەنها بۆ مەبەستی دەرخستنی مەزنیی وەحیی قورئان و بەرزی و بڵندیی پایەیەتی.

پاشان ئەم ڕوونکردنەوە بەسام و هەیبەتەی قورئان و دەرخستنی ئەم هێزە گەورە و جەمبووەی ئاسمانەکان ئەوە ناگەیەنێت کە جینی و شەیتانەکان توانا و هێزێکی ئەوتۆیان بێت کە ئاسماننشینان ناچاری زۆرانبازیی بەرگری لێکردنیان بکات، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە جینی و شەیتانەکان بە هیچ جۆرێك بواری دەستتێوەردانیان لە هیچ شوێنێکی ئەم ڕێگا دوور و درێژەدا نییە کە لە دڵی پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ دەست پێدەکات و بەرەو جیهانی ئاسمانەکان و لەوێشەوە بۆ عەرشی مەزن درێژە دەکێشێت.

بەم چەشنە، قورئانی پیرۆز دەری دەبڕێت کە وەحیی قورئان ڕاستییەکی هێندە مەزن و شکۆمەندە شایانی ئەوەیە جێی باس و لێدوانی سەرجەمی مەلەئی ئەعلا و مەلائیکەتان بێت لەو ئاسمانە مەزنانەدا، بە ڕادەیەك کە شەیتانەکان ناچار بن بەرەو ئەو ئاسمانانە سەربکەون تا شتێکیان لە هەواڵەکانی ئەوێ دەست بکەوێت، بەڵام تیرباران دەکرێن و هیچ شتێکیان دەست ناکەوێت.

جا قورئانی پیرۆز بە باسکردنی ئەم ڕەجم و تیربارانە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو وەحییە قورئانییەی بۆ سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ و بۆ حەزرەتی جبریل - دروودی لەسەر بێت - نازڵ بووە کە هاتووەتە کۆڕی پێغەمبەر ﷺ و، ئەو حەقیقەتە غەیبییانەش کە لە پێش چاوی بینینی پێغەمبەردا بوون ﷺ.. هەر هەموویان، ڕاست و دروستن و، هەرگیز هیچ شوبهە و گومانێك لە هیچ ڕوویەکەوە توخنیان ناکەوێت.

بەم جۆرە قورئانی پیرۆز، بە ئیعجازە ڕەوانەکەی خۆی، ئەم مەسەلەیە دەردەبڕێت و ئاشکرای دەکات.

پاشان سەبارەت بە بینینی بەهەشت لە نزیکترین شوێنەوە و لێکردنەوەی بەروبوومەکانی هەندێ جار، هەرچەندەش تابڵێی لە ئێمەوە دوورە و لە جیهانی مانەوەی ئەودنیادایە، ئەوا بە بەڵگەی ئەو دوو نموونەیەی پێشوو دەزانرێت کە:

ئەم جیهانە بینراوە فانییە پەردەیەکە بەسەر ڕووی جیهانی غەیب و جیهانی مانەوەی ئەودنیادا. ئەوەتا هەرچەند مەڵبەندی مەزنی بەهەشت لە شوێنێکی یەکجار دووردایە، کەچی بەهۆی ئاوێنەی جیهانی میسالەوە دەتوانرێت لە هەموو لایەکەوە بەهەشت ببینرێت. هەروەك دەشتوانرێت بەهۆی ئەو ئیمانەوە کە گەیشتووەتە پلەی "حق الیقین" بەهەشت لەم جیهانە فانییەدا چەند فەرمانگە و موستەعمەرەیەکی هەبێت (دیارە ڕەخنە لە نموونە هێنانەوە

ناگیرێت) هەروەها دەگونجێت لە ڕێی ڕۆحیانەتە بەرزەکـان و تەلەفـۆنی دڵەوە پەیوەندی و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو جیهانەدا بکرێت و، دەشـگونجێ بەروبـوومی ئەوێ بگاتە ئێرە.

* * *

سـەبارەت بە سـەرقاڵبوونی فەرمـانگەیەکی "کـوللی"ش بە ڕووداوێـکی شەخسی و جوزئییەوە. واتە سەبارەت بەوەی کە لە تەفسیرەکاندا وتراوە:

شـەیتانەکان بـۆ ئاسـمانەکان سـەردەکەون و لەوێ گـوێ هەڵـدەخەن و، سووسەی دەنگوباس دەکەن و، هەواڵی غەیبیی دەستهەڵبەست بـۆ کاهینەکـان دەهێننەوە.. دەبێ حەقیقەتەکەی بەم جۆرە بێت:

هەرگیـز بـواری ئەوە نادرێـت کە بـۆ پـایتەختی جیهـانی ئاسـمانەکان سەربکەون تا ئەو هەواڵە جوزئییەیان دەست بکەوێت. نەخێر، بەڵکو مەبەسـت سەرکەوتنیانە بۆ هەندێ شوێنی جـوزئی لە بۆشـایی هەوادا کە واتـای وشـەی "سەماوات" شموولی دەکات و، چەند شوێنێکی تێـدایە وەك پاسـگا(مَخْفَر)ی ئاسمانەکان (ڕەخنە لە نموونە ناگیرێت) وان و، لەو شـوێنە جوزئییـانەدا چەنـد پەیوەندییەك بە گۆی زەوییەوە دەکرێت.

جـا شـەیتانەکان لەو شـوێنە جوزئییـانەدا گـوێ ڕادەگـرن، تـاکو هەواڵـی ڕووداوە جوزئییەکـان بەدەسـت بهێـنن، تەنـانەت دڵـی مـرۆڤ یەکـێکە لەو مەقامانە! ئەوەتا مەلائیکەتی ئیلهام لەوێدا لەگەڵ شـەیتانی تایبەتیـدا دەکەوێـتە زۆرانەوە!

بەڵام حەقیقەتەکانی قورئان و ئـیمان و ڕووداوەکـانی ژیـانی پێغەمـبەر ﷺ هەرچەندەش جوزئی بن، بەڵام لە فەرمـانگەی ئاسـمانەکان و عەرشی مەزنـدا وەك مەزنترین و گەورەترین ڕووداو وان، تەنانەت دەڵێـی لە گۆڤـار و ڕۆژنـامە مەعنەوییەکانی موقەددەراتی گەردوونیی خواوەندا (ڕەخنە لە نموونەهێنـانەوە

ناگیرێـت) هەواڵیـان لە بـارەوە بـڵاو دەكـرێتەوە، بە چەشـنێك كە لە هەمـوو گۆشـــەیەكی ئاســـمانەكاندا، لە بارەیـــانەوە و ســـەبارەت بە یەك بە یەكی مەسەلەكانیان گفتوگۆ و لێدوان دروست دەبێت..

چـونكە هەر لە دڵـی پێغەمـبەری خۆشەویسـتەوە ﷺ تـا دەگـاتە عەرشی ئەعزەم لە هەر دەستێوەردان و خۆ تێهەڵقورتاندنێكی شەیتانەكان پارێزراوە.

جـا قورئـانی پیـرۆز لەگەڵ ڕوونكـردنەوەی ئەمـانەدا، بەم ئـایەتە پیـرۆزانە ئەوەش دەردەبڕێت كە:

شەیتان هـیچ فێـڵ و هۆكـارێكی بە دەسـتەوە نیـیە بـۆ وەرگرتنـی هەواڵـی ئاسمانەكان، مەگەر سووسەكردن و گوێهەڵخستن.

قورئانی پیرۆز بەم ڕوونكردنەوە موعجیز و بەلیغەی خۆی دەریخست كە:

چەندە وەحیی قورئان مەزنە و، چەندەش پلەوپایەیەكی گەورەی هەیە!

هەروەك دەریخســت كە پێغەمبەرایەتیــی حەزرەتی محەمــمەد ﷺ چەنـدە ڕاست و دروستە! تەنانەت بە هیچ شوبهە و گومانێك و بە هیچ شێوەیەك هیچ كەسێك ناتوانێت توخنیان بكەوێت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە .
* لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" نێژراون.
* چوارەم مناڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن:
(دوڕڕیە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).
* لە پێشدا لە لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برا گەورەی دەستی بە سەرەتاکانی خوێندن کردووە. پاشان چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و، لای زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چوارده ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەست هێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.
* لەبەر زیرەکیی ناوازە و لە ڕادەبەدەری، نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سەردەم شان بە شانی زانستە ئاینییەکان. لەم پێناوەشدا لە لایەن دواهەمین دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانییەوە ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.

* گەورەترین زانا و كەسایەتیی كوردی ئەم سەردەمەیە كە لە دوای مەولانـا خالیـدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی كورددا هەڵكەوتووە و، ناوبـانگی جیهـانیی بـۆ دروسـت بووە و، لە ڕووبەرێكی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەكانی وەردەگیرێت.
* تاكە كەسایەتی بووە كە هەموو زەبر و زەنگـێكی ڕژێمـی مسـتەفا كەمـال و، سی و پێـنج سـاڵی بەنـدی و دوورخسـتنەوە و دەستبەسـەری و دەیـان دادگـای تـۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆكی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی كۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەركەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی كتێب و نامیلكەی لە ژێـر ناونیشـانی (**سـەرجەمی پەیامەكـانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی كردوونەتەوە.
* وەرگێـڕانی سـەرجەمی پەیامەكـانی نـوور بـۆ (زمـانی عەرەبی) لە لایەن مامۆسـتا (ئیحسان قاسم صـاڵحی)یەوە لە دە دانە بەرگـی گەورەدا تەواو بـووە و، لە وڵاتـانی توركیا و میسـر و هیندسـتان و عەرەبسـتانی سعوودی چەنـد چـاپێكی یەك لە دوای یەكیان تا ئێستا لێ بڵاوكراوەتەوە.
* بەشێكی زۆریشیان لە لایەن خوشكی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوكران واحیـدە)وە كراون بە (زمانی ئینگلیزی) و بڵاو كراونەتەوە.
* بە (زمانی كوردی)ش (**سەرجەمی پەیامەكانی نوور**)مان لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ كردووە، جگە لە چل و یەك كتێب و نامیلكەی سەربەخۆ.
* چەندین كتێبی تر بە زاری كرمانجیی ژووروو بڵاوكراونەتەوە.
* چەند بەشێكی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خـوارەوەش وەرگێـڕراون، كە تـا ئێسـتا كاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:
(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتاڵی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەكی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیكی، تەتاری، تالْشی، توركمانی، جـۆرجی، چینی، دانیماركی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسكریتی، سـلۆڤاكی، سـەواحیلی، سویدی، فەرەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرغیزی، كازاخی، كۆری، كـرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مـالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیـری، هۆسـا، هیـبرۆ، هینـدی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی).
* تا ئێستا زیاتر لە شەست كۆنفرانسی جیهانی و دەیـان كـۆڕی زانسـتی و پێشـبڕكێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر كراوە و، دەیان كتێـب و، سـەدان لێكـۆڵینەوەی

لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.

* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.

* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبووڵ لە بەرواری (١-٣/١٠/٢٠١٧ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.

* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار ساز کراوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).

* هەروەها کۆڕبەندێك لە بەرواری (٢١/١٢/٢٠١٣ز) لە شاری هەولێر لە لایەن پەیمانگای زانستە ئیسلامییەکان و وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستانەوە ڕێکخرا بە بەشداریی چەند توێژەرێکی ناوخۆی کوردستان و وڵاتی تورکیا و، بە ئامادەبوونی دەیان کەسایەتیی زانستی و ئایینیی عێراق و هەرێم.

* هەروەها لە بەرواری (١٢/١٢/٢٠١٥ز)دا لە شاری هەولێر نەدوەیەکی زانستی لە لایەن (ڕێکخراوی پەیامی پاك)ەوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی ساز کرا بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەکانی نووردا" کە چەند توێژەرێکی باکووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.

* لە بەرواری (٢٦/٣/٢٠١٦ز)شدا لە شاری هەولێر لە لایەن (ئەمینداریێتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق) و بە بەشداریی سەنتەری ڕۆشنبیریی (وقف الخيرات) نەدوەیەکی ڕۆشنبیری بە ناوی (الإمام بديع الزمان سعيد النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان) بەڕێوەچوو چەند باس و بابەتێکی بە زمانی عەرەبی تێدا پێشکەش کرا.

* دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە شاری سلێمانی لەساڵی (٢٠١٦)دا ژمارە (٨٩)ی بڵاوکراوەی (ڕۆڤار)ی تایبەت کرد بە مامۆستا نوورسی بە ناوی (سەعید نوورسی.. کلیلی گەنجینەیەکی شاراوە).

* هەتا ئێستا لە باشووری کوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

# پێڕستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

# چەپکێک
# پەروەردەی ئیمانی

**ئەگەر دەتەوێ بزانیت:**

❁ هەموو بەدیهاتوویەك ئەركێكی لە ئەستۆدایە، تەنانەت مێش و مێرووەكانیش ڕۆڵی كارگوزاری ژینگەپارێزی دەبینن و ماددە ژەهراوییەكان دەگۆڕن بە شتی تر؟

❁ لە واتای وردی هەندێ ئایەتی قورئان تێبگەیت سەبارەت بە نیعمەتەكانی خوای گەورە؟

❁ لە پشت پەردەی گەمە و پێكەنینە كاتییەكانەوە چەندین حاڵەتی گریانهێنەر خۆیان مەڵاس داوە، بەڵام ئایا لە بەرامبەریانەوە چ شتێك "شادمانی" بە "گیان"ی مرۆڤ دەبەخشێت؟

❁ خوای گەورە لەناو خودی كردەوە چاكەكاندا پاداشت و، لەناو كردارە خراپەكانیشدا سزایەكی خێرای داناوە؟

ئەگەر پێت خۆشە لە چەپكێك زانیاری وەك ئەمانە شارەزا ببیت، ئەوا فەرموو ئەم كتێبە بچووكە بە شێنەیی بخوێنەرەوە.

## باقةٌ مِن التربيةِ الإيمانية

من كليات رسائل النور
التي ألفها الأستاذ:
بديع الزمان سعيد النورسي
(رحمه الله)

## A Bouquet of Faith Cultivation

From
The Risale-i Nur Collection
By:
Bediuzzaman Said Nursi



0-0263-0000-1
9 780026 300001

نرخی (١٠٠٠) دینارە